# کاریگەری

# جنۆکەوشەیتان

## چونەژوورەوەیان بۆجەستەی ئینسان

کۆکردنەوەو ئامادەکردنی


أیاد محمد قادر (أبو إلیاس)


١٤٤١ کۆچی -٢٠٢٠ زاینی



# پێناسی کتێب

ناوی کتێب : کاریگەری جنۆکەو شەیتان چوونەژوورەوەیان بۆ جەستەی ئینسان

ئامادەکردنی : أیـادمحمد قـــادر **(أبو إلياس)**

پێداچوونەوە : مامۆستا بهمن کەلاری

تایپ ودیزاین : م.سیروان شێخ لەنگەری

چاپخانە :

نۆبەی چاپ : یەکەم ٢٠٢١

تیراژ :

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی

(١٤٧٦ ) ی ساڵی ٢٠٢١ ی پێدراوە.

## پێشەکی

سەرەتا بەناوی خوای گەورەو میهرەبان درودو سەلام لەسەر پێغەمبەری خودا(صلى الله عليه وسلم)، بەکورتی وپوختی ئەم پەرتووکە باسێکە بۆ روونکردنەوەی ئەو بابەتانەی کە پەیوەستن بە کاریگەری جنۆکەو شەیتان لەسەر جەستەو دەرونی مرۆڤ و نەخۆشخستن و تێکدان و هەندێ جار دەگاتە ڕادەی مردن و لەناوچوونی مرۆڤەکە، مەبەست لە ئامادەکردن و دانانی ئەم پەرتووکە دەگەڕێتەوە بۆ بڵاوبوونەوەی ئەو بیرورا و بۆچوونانەی کە دژی ئەوەن کە جنۆکە بچێتە جەستەی مرۆڤەوە وکاریگەری هەبێت لەسەری بێگومان ئەم بیرۆکەیەش لەگەڵ بیروباوەڕی موسڵمان ڕاستەقینە و دەقەکانی قورئان و سوننەت یەکناگرێتەوە،هەروەها هۆکارێکی تر کەهاندەربوو بۆنوسینی ئەم پەرتوکە  نەبوون یاخود کەمی سەرچاوەو بابەتی پێویست پەیوەست بەم بابەتەوە بەزمانی شیرینی کوردی ئەم هۆکارانەو گەلێك هۆکاری تریش هانی ئەوەی دام کە بیرلە ئامادەکردنی ئاوا بەرهەمێك بکەمەوە، داڕشتنی ئەم پەرتوکە بەشێوازی پرسیارو وەڵامە بۆئەوەی خوێنەر هانبدات زیاتر و ڕوونتر لە بابەتەکە تێبگات و بۆی روونبێتەوە بۆ وەڵامی سەرجەم پرسیارەکانیش پشت بەستراوە بە بەڵگە لە قورئانی پیرۆز و سوننەت و ڕای زانایانی پێشین و پاشینی ئەهلی سوننە .

بۆیە داواکارم لە خوای گەورە هیدایەتمان بدات و نیەت پاکیمان پێببەخشێت لە کردەوەو گوفتارەکانماندا و توانیبێتمان ئەگەر خزمەتێکمان بە ئاینی پیرۆزی ئیسلام کردبێت و سوودێکان گەیاندبێت بە کتێبخانەی ئیسلامی خوای گەورە بە چاکەو پاداشت بۆمان حیساب بکات و لە گوناهی خۆمان و دایك و باوك و خێزان و تەواوی موسڵمانان خۆش بێت وصل اللهم وسلم علی نبینا محمد و علی اله و صحبه اجمعین .

أبو إلياس

پ١/جنۆكه جیهانی سیٚ یەمە لەدوای جیهانی مرۆڤ و فریشتەكان.ئەوانیش وئەرك و فرمانیان لەسەرە؟

ولاّم/ جنۆكه جیهانێكی سیٚ یەمن جگە له جیهانی فریشته ومرۆڤەكان، نەئاون ونە میكروبن. كەهەندێك واگومانیان بردووە،ئەوانیش دروستكراوێكی ژیرو هۆشیارن و تیدەگەن و جیهانێكن ئەرك و فرمانیان لەسەرە و فرمانیان پی كراوە و نەهیان لیٚ كراوە.(عالم الجن والشياطين لسليمان الأشقر ص١٣).

زانایان ئەم ئایەتە دەكەن بەلّگەی ئەوەی كە ئەرك وفرمانیان لەسەرە بیر دەكەنەوە و تیٚ دەگەن هەروەكو مرۆڤ خودای گەورە دەفەرمویٚ: (قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِنَ الْجِنِّ فَقَالُوا إِنَّا سَمِعْنَا قُرْآنًا عَجَبًا* يَهْدِي إِلَى الرُّشْدِ فَآمَنَّا بِهِ وَلَنْ نُشْرِكَ بِرَبِّنَا أَحَدًا)(الجن-١و٢) واتە: ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)بلّیٚ: نیگام بۆ كرا كە بێگومان چەند كەسێك لەجنۆكە گوێیان گرت (لە قورئان خوێندنەوەم) ئینجا وتیان: بەڕاستی ئێمە قورئانێكی سەر سوڕهێنەرمان بیست ، ئەو قورئانە، هیدایەت و ڕێنمایی دەكات بۆ ڕێی ڕاست و هەق، ئێمەش بڕوامان پێهێنا وهەرگیز هیچ كەسێك ناكەینە شەریك و هاوبەشیی پەروەردگارمان .

پ٢/ هەرلەكۆنەوە مرۆڤ بڕوای بەبونی جنۆكە هەبووە لەشەڕ و خراپەیان ترساوە؟

ولاّم/ بەبەلّگەی ئەم ئایەتە (وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِنَ الْإِنْسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِنَ الْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا) (الجن-٦) واتە:بەڕاستی پیاوانێك لە ئادەمیی پەنایان دەبردە بەر پیاوانێك لە جنۆكە (كە بیان پارێزن)كەچی زۆرتر ماندوویان دەكردن.

ابن سعود لەتەفسیرەكەیدا دەلّێت: لەپێش ئیسلامدا هەركاتیٚ پیاوێك لە عەرەبەكان لە دۆلّ وشیوێكدا شەوی بەسەردا بهاتایە یاخود ڕێی بكەوتایە بەجێگایەكی چۆلّەوانی و شەوی بەسەردا بهاتایە و ترسی لیٚ بنیشتایە،ئەوە لەترسی جنۆكەی ئەو دۆلّ و شیوە،پەنای دەبردە

بەر گەورەکەیان پەنای بدات لە زیانی جنۆکەی ئەو جێگەیە، وە ئەی گوت: (أعوذ بسيد هذا الوادي من سفهاء قومه) پەنا دەبەمە بەرسەرۆکی جنۆکەی ئەم دۆڵ وشیوە،تا نەفامەکانی ئازارم نەدەن. (إرشاد العقل السليم - أبو السعود سورةالجن-٦)

پ٣/جنۆکەش دروستکراوێکی خودان هەروەکو مرۆڤ خودای گەورە بۆ پەرستنی خۆی دروستی کردوون؟

وەڵام/ خودای گەورە دەفەرموێ: ( وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ) (الذاريات-٥٦ ) واتە: من جنۆکە و ئادەمیزادم تەنها بۆ ئەوە دروست کردووە کە بەندایەتی من بکەن.من بپەرستن.

پ٤/ بنچینەو بنەڕتی جنۆکە لەئاگردروستکراوە؟

ولّام /خودای گەورە پێی ڕاگەیاندوین کە جنۆکەی لەئاگردروستکردووە : (وَالْجَانَّ خَلَقْنَاهُ مِنْ قَبْلُ مِنْ نَارِ السَّمُومِ) (الحجر-٢٧) واتە:جنۆکەشمان پێشتر دروست کرد لە ئاگرێکی بەتین. (وَخَلَقَ الْجَانَّ مِنْ مَارِجٍ مِنْ نَارٍ) (الرحمن -١٥) واتە: وە جنۆکەی دروست کرد لە بڵێسەی ئاگرێکی بێ دووکەڵ.

لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا (مِنْ مَارِجٍ مِنْ نَارٍ) دەڵێن واتە خودای گەورە جنۆکەی لە بڵێسەی ئاگر لەبەشە پاك و چاکەکەی دروست کردووە . ئەمە ووتەی ئیبن وعەبباس و عیکریمە و موجاهید و حەسەن و ئەوانی دیکەشە. (البداية والنهاية ج١/١٢٨)

لە عائیشەوە، پیغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی (خُلِقَتِ الملائكةُ من نُّورٍ ، و خلق الجانَّ من مارِجٍ من نارٍ،و خلق آدمَ مِما وُصِفَ لكمْ ) (صحيح مسلم٢٩٩٦) (صحيح الجامع٣٢٣٨)

واتە: فریشتە لە نور و ڕوناکی دروستکراون و جنۆکەش لە ئاگر دروستکراون و ئادەمیش لەوەی بوتان وەسف کراوە هاتوتە دروست کردن. گومان لەوەدا نیە جنۆکە لە پێش مرۆڤ دروست کراون چونکە خودای گەورە دەفەرموێ: (وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ صَلْصَالٍ مِنْ حَمَإٍ مَسْنُونٍ* وَالْجَانَّ خَلَقْنَاهُ مِنْ قَبْلُ مِنْ نَارِ السَّمُومِ)(الحجر -٢٦-٢٧) واتە: بەدڵنیای ئێمە ئینسانمان لە قوڕێکی

وشك دروست كرد كه پێشتر قوڕێكی ڕەشباو و ترشاو بوو،  پەریشمان پێشتر له ئاگرێكی بەتین دروست كرد كه به وردیله كونەكاندا تێدەپەڕێت.

ئەوه ئاشكرایه به پێی بەڵگەی ئایەتەكه جنۆكه پێش مرۆڤ دروستكراوه. بەڵام بەڵگەی ڕاست نیه لەبەر دەستدا كه بیسەلمێنێت كەچەندێك پێش مرۆڤ بووه، هەرچەندە **ئیبن كثیر** له (البدایه والنهایه)دا له عبدالله كوڕی عومەر دەی گێڕێتەوه جنۆكه پێش مرۆڤ دروست كراوه به هەزار ساڵ بەڵام سەر زەوی خراپەكاریان ناوەتەوه و خوێنێكی زۆریان ڕشاندوه. خودای گەوره سەربازی له فریشتەكان بۆیان ناردوه و دەریانی كرد بۆ دورگەو دەریاكان. له ئیبن عەباس یشەوه هەربەوجۆره دەیگێڕێتەوه . بەڵام هەرچەندە ئەم ووته له هەندێ له هاوەڵەكانی پێغەمبەرەوه هاتووه بەڵام جێگرنەبوو كەگەیشتبێت بەپێغەمبەری خودا و ووتەی ئەو بێت، نەبەرێچكه سەنەدی سەحیح نه بەحەسەن و نه بەزەعیفیش (البداية والنهاية ج١/١٦٦).

پ٥/ ئبلیس باوكی هەموو جنۆكەیەو به بێ باوەڕی جنۆكەكانیش دەگوترێت شەیتان؟

وڵام/ بەبەڵگەی ئەم ئایەته (فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ الْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ )(الكهف-٥٠)

واته هەر هەموو سوژدەیان برد(بۆئادەم) جگه لەئیبلیس كه له دەستەی جنۆكەو پەریەكان بوو .

زۆربه هەره زۆری زانایان دەڵێن (ئبلیس)ی نەفرین لێ كراو باوكی هەموو جنۆكەیه، وەجنۆكەش باوەڕدار و بێ باوەڕیان هەموویان نەوەی ئەون وەكو چۆن ئادەم باوكی هەر هەموو مرۆڤه. ئەمەش ووتەی ابن عباس و**مجاهد** وقتادە حەسەنی بەسری و  ئەوانی دیكەشه. تفسير الطبري" (١/٥٠٧) ،"الدر المنثور" (٥/٤٠٢)

شێخ الاسلام ابن تیمیه بەڕەهای لەزۆربەی شوێنەكاندا ناوی ئیبلیس ی وەك باوكی جن ناوبردووه. مجموع الفتاوى" (٤/٣٤٦،٢٣٥).

شێخ بن باز دەڵێت: شەیتان باوكی جنۆكەیه لای كۆمەڵێك زانایان، ئەو بووه سەرپێچی خودای گەورەی كردووه خۆی بەگەوره زانیوه و سوژدەی بۆ ئادەم نەبردوه خودای گەورەش

لەرەحمەتی خۆی بێ بەشی کردوە. مجموع الفتاوی (٩/٣٧٠-٣٧١)

شێخ ابن عثیمین دەڵێت: بێ هیچ گومان و دوودڵیەك ئبلیس جنۆکەیە. چونکەخودای گەورە خۆی دەفەرمویێت ( أَفَتَتَّخِذُونَهُ وَذُرِّيَّتَهُ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِي ) (الكهف-٥٠) واتە: ئایا ئێوە (ئەی ئادەمیزادەکان) ئەو(ئیبلیس)و نەوەکانی دەکەن بەدۆست و پشتیوانی خۆتان لە جیاتی من .
ئەم ئایەتە بەڵگەیە کە (ئیبلیس)زاوزێ دەکات و نەوەی هەیە بەڵام چۆن دەبێت ئێمە نازانین زانین و نەزانینی ئەم بابەتەش زیانی نیە. (فتاوى نور على الدرب/ الجن والشياطين/سؤال رقم/٢ )

هەندێ ڕایان وابووە کە لەوانەیە (ئیبلیس) کە گوایە فریشتە بووبێت وپاشان سەرپێچی کردووە. یان هەندێکی تر دەڵێن، یان هەر جنۆکەیەو لەناو فریشتەکاندا ژیاوە، و فەرمان بەسوژدەکە ئەویشی گرتووەتەوە..؟ بەڵام ئەمە پێچەوانەی بەلگەکانە چونکە فریشتە هیچ کاتێك تاوان و سەرپێچی لەفەرمانی خوا ناکات، وەکو خودادەفەرموێت: (لَا يَسْبِقُونَهُ بِالْقَوْلِ وَهُمْ بِأَمْرِهِ يَعْمَلُونَ) (الأنبياء-٢٧) واتە: ئەو فریشتانە هەرگیز (بێ فەرمانی (خودا)ناکەن و بە فەرمانی ئەو دەجولێنەوە و فەرمانی ئەو جێبەجێ دەکەن.
(لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ) (التحريم -٦) واتە: نافەرمانی خودا ناکەن لەوەی کە فەرمانیان پێ بدات وە چ فەرمانێکیان پێ بدرێ جێ بەجێ ی دەکەن.
وەهەروەها سروشتی (فریشتە)و (ئیبلیس )وەك لەم فەرموودەیەدا هاتووە زۆر لەیەك جیاوازە پیغەمبەری خودا(صلى الله عليه وسلم) فەرمویەتی (خُلِقَتِ الملائكةُ من نُورٍ، و خلق الجانَّ من مارِجٍ من نارٍو خلق آدمَ مِما وُصِفَ لكمْ ) (صحيح مسلم٢٩٩٦) (صحيح الجامع٣٢٣٨) واتە: فریشتە لە نور و ڕووناکی دروستکراون و جنۆکەش لە ئاگر دروستکراون و ئادە میش لەوەی بوتان وەسف کراوە هاتوتە دروست کردن.
بەم بەڵگانەی دەتوانین بڵێین (ئیبلیس) هیچ کات وساتێ فریشتە نەبووە وەکو چۆن(حەسەنی بەصری) دەڵێت: تەنانەت بۆچاو تروکانێکیش ئیبلیس لەفریشتەکان نەبوە،بەڵکو ئبلیس باوك وبنەڕەتی جنۆکەیە چۆن ئادم باوك وبنەڕەتی مرۆڤە.(البداية والنهايةج١/٧٩ )

ابن حجر دەڵێت: شەیتان وجنۆکە یەك ناون بۆ یەك دروستکراو بەڵام دابەش دەبن بۆ دوو

گروپ بە گروپی بێ باوەڕ ەکانیان دەوترێت شەیتان وبەگروپی مسوڵمانەکانیشیان ناونرێت بەو ناوە . (فتح الباري (٨/٦٧٥)

الرازی دەڵێت : ڕای ڕاست ئەوەیە: شەیتان بەشێکە لە جنۆکە بە گروپی بێ باوەڕ ەکانیان دەوترێت شەیتان وگروپی مسوڵمانەکانیشیان ناونرێن بەو ناوە.(مفاتيح الغيب -تفسيرسورة الحجر-٢٧)

پ٦/ جنۆکە هاوسەرداری دەکەن و منداڵیان دەبێت و زیاد دەکەن؟

وڵام: خودای گەورە دەفەرموێت : (فِيهِنَّ قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنْسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَانٌّ) (الرحمن-٥٦)

واتە: بەهەشت ئافرەتانێکی تێدایە تەنها سەیری مێردەکانی خۆیان ئەکەن بەر لەومێردەبەهەشتیانەیان، هەرگیز هیچ کەسێ لە ئادەمیی ولە جنیی لەگەڵیان جووت نەبووە.

ابن حجر الهيتمی: دەڵێت ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی جنۆکەش **(الطمث)**جوت بون و **(الافتضاض)**واتە: دڕینی پەردەی کچێنیان هەیە، بە هەبونی خوێن لەکاتی جوت بوندادەگوترێت **(الافتضاض)**.(الفتاوى الحديثية-٦٨)

( أَفَتَتَّخِذُونَهُ وَذُرِّيَّتَهُ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِي ) (الكهف-٥٠) واتە: ئایا ئێوە (ئەی ئادەمیزادەکان) ئەو(ئیبلیس)و نەوەی دەکەن بەدۆست و پشتیوانی خۆتان لە جیاتی من.

شێخ ابن **عثيمين** دەڵێت : ئەم ئایەتە بەڵگەیە کە (ئیبلیس) زاوزێ دەکات و نەوەی هەیە بەڵام چۆن دەبێت ئێمە نازانین .زانین و نەزانینی ئەم بابەتەش زیانی نیە.(فتاوی نور على الدرب/ الجن والشياطين/سؤال رقم/٢ )

لە ئبن زیدەوە دەگێڕنەوە خودای گەورە بە (ئبلیس)ی فەرمووە .هیچ نەوەیەکم بەئادەم نابەخشم ئەبێ نەوەیەکی تۆش لەگەڵیدا بێت. واتە ئادەم هەر منداڵێکی دەبێت ئەوهاونشین(قەرین)ێك لەشەیتان لەگەڵیدا لەدایك دەبێت. (تفسير روح المعاني- ١٥/٢٩٤)

ئەم گوتەیەی ئبن زەید دەیگێڕێتەوە دەتوانین ئەو فەرموودەی ئبن مسعودی بۆ بکەینە بەبەڵگەکە دەڵێت: پێغمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (ما منكُم مِن أحَدٍ، إلَّا وقدْ وُكِّلَ به قَرِينُهُ مِنَ الجِنِّ قالوا: وإيَّاكَ؟ يا رَسولَ اللهِ، قالَ: وإيَّايَ، إلَّا أنَّ اللَّهَ أعانَنِي عليه فأسْلَمَ، فلا يَأْمُرُنِي إلَّا بخَيْرٍ. .) (مسلم٢٨١٤) واتە: هیچ کەس لە ئێوە نیە هاونشینێك(قرين) لەجنۆکە لەگەڵێتی،گوتیان ئەی پێغەمبەری خودا(صلی الله علیه وسلم) تۆش فەرمووی منیش، تەنها ئەوە نەبێت.خودای گەورە یارمەتی منی داوە هاونشینەکەم مسوڵمان بووە ، لەخێرو چاکە زیاترفرمانم پێ ناکات.

بەڵگەش لە ئایەت کەهەموو کەسێك هاونشینێك لەشەیتانی هەیە خودای گەورە دەفەرموێت: (قَالَ قَرِينُهُ رَبَّنَا مَا أَطْغَيْتُهُ وَلَكِنْ كَانَ فِي ضَلَالٍ بَعِيدٍ) **(ق -٢٧)** واتە: هاوڕێ و هاونشینە شەیتانەکەی، پاکانە بۆخۆی دەکاو دەڵێ: ئەی پەروەردگارمان من بێ بڕواو گومڕام نەکرد ، بەڵکو ئەو خۆی لەناو گومڕاییەکی دوور لە هیدایەتدا بوو، بەڵگەیەکی تر کەزانیان پشتی پێ دەبەستن کە جنۆکە هاوسەرگیری دەکەن و زاوزێ دەکەن خودای گەورە دەفەرموێت: (وَأَنَّهُ كَانَ رِجَالٌ مِنَ الْإِنْسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِنَ الْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا ) **(الجن –٦)** واتە:بەڕاستی پیاوانێك لە ئادەمیی پەنایان دەبردە بەر پیاوانێك لە جنۆکە (کە بیان پارێزن) کەچی زۆرتر ماندوویان دەکردن. لێرەدا باسی پیاوانی جن دەکات کەواتە ئەگەرپیاویان هەبێت ئافەرتیانیش دەبیت وهاوسەرگیری ومندالبونیش ڕوددەدات. العقيدة الإسلامية وأسسها٢/٢٧

وەهەروەها ئەم فەرمودەیەش دەبێتە بەڵگە: كانَ النبيُّ (صلی الله علیه وسلم) إذَا دَخَلَ الخَلَاءَ قالَ: (اللَّهُمَّ إنِّي أعُوذُ بكَ مِنَ الخُبُثِ والخَبَائِثِ).(صحيح البخاري-١٤٢) واتە پێغمبەری خودا(صلی الله علیه وسلم) کاتێك دەستی بگەیانایەتە ئاو دەیفەرموو خودایە پەنات پێ دەگرم لەهەموو شەیتانێکی نێرو مێ ، ئەم فەرمودەیەش مانای وایە جنۆکە نێرو مێ یان هەیە،کەواتە وەکو ووتمان ئەگەر نێرو مێ هەبێت وهاوسەرگیری ومندالبونیش ڕوددەدات.

پ٧/ شوێنی نیشتە جێ بوونی جنۆکە؟

وڵام/ ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەرئەوەی جنۆکە ش لەسەر زەوی دەژێت دوای ئەوەی بوە هۆکاری ئەوەی کەئادەم وحەوا سەرپێچی خودای گەورە بکەن و لەبەهەشت دەربکرێن.

(فَأَزَلَّهُمَا الشَّيْطَانُ عَنْهَا فَأَخْرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ ۖ وَقُلْنَا اهْبِطُوا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ وَلَكُمْ فِي الْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَاعٌ إِلَىٰ حِينٍ) (البقرة -٣٦) واتە: ئینجا شەیتان هەڵی خەڵەتاندن لە بەهەشتدا وەلەو خۆشگوزەرانیەی کە تێیدابوون دەری پەڕاندن وە وتمان: (بە ئادەم وحەواو شەیتان) بچنە خوارەوە(بۆ سەر زەوی) هەندێکتان دوژمن ئەبن لەگەڵ هەندێکتاندا وە بۆتان هەیە جێگیربوون لەسەر زەوی وە بەهرەمەندی(و ئارەزووی دونیا) تاماوەیەکی دیاری کراو(مردن).

ئەو دەرکردنەکەش بۆسەرزەوی لەیەك کاتدا بوو پێکەوە (ئادەم و حەواو دووژمنەکەیان شەیتان)دوای سەرپێچیەکەیان (تفسير القرطبي-٣١٩/١)

(وَالْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ) **(الرحمن—١٠)** واتە: وە زەویشی داناوە بۆ هەموو دروستکراوەکان، تا هەمووخاوەن گیانێکی تیابژی.ئبن **كثير** دەی گێڕێتەوە لە(ئبن عباس و**مجاهد** وقتادە و ئیبن زید) وە کە **(الأنام)** واتە هەموودروست کراوەکان لە جنۆکە ومرۆڤ و ئەو زیندەوەرەکانی دیکەش.

(تفسير ابن كثير-٤/٢٧٠)

خودای گەورە لەسورەتی (الرحمن)دا دوای ئەوەی کە باسی زەوی نیعمتەکانی ئەکات بەسەر جنۆکەوە مرۆڤەوە دەفەرموێت :(فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ )(الرحمن-١٣) واتە: لەکام چاکەی پەروەردگارحاشادەکەن؟ جا ئیتر بەکام نیعمەت لە نیعمەتەکانی پەروەردگارتان (ئەی گرۆی ئادەمیی و جنیی) ناشوکری دەکەن.

جنۆکە وشەیتان لەشوێنە چۆلەکان و پیسەکاندا ئامادە دەبن بەبەڵگەی ئەم فەرموودە(إن هذهِ الحشوشُ محتضرةٌ،فإذا أتي أحدكُم الخلاءَ فليقُلْ:أعوذَ باللّهِ من الخُبْثِ والخبائثِ)(السلسلة الصحيحة-١٠٧٠) واتە ئەم باخ و باخاتانە شوێنی ئامادەبوونی شەیتان و جنۆکەکانە هەرکەسێکتان دەست گەیاندە ئاو بۆتارات کردن چووە ئەویٚ بابلێت خودایە پەنادەگرمە تۆ لە هەموو شەیتانێکی نێرو مێ)

هەروەها بازاڕەکانیش شوینی شەیتانەکانن بەبەڵگەی ئەم فەرموودە: (لَا تَكُونَنَّ إنِ اسْتَطَعْتَ، أَوَّلَ مَن يَدْخُلُ السُّوقَ وَلَا آخِرَ مَن يَخْرُجُ منها، فإنَّهَا مَعْرَكَةُ الشَّيْطَانِ، وَبِهَا يَنْصِبُ رَايَتَهُ) (مسلم-٢٤٥١) واتە : ئەگەر توانیت یەکەم کەس مەبە کە دەچێتە بازاڕەکان و وەکۆتا کەسیش مە بە کەلەبەزاڕەکان دەردەچێت .چونکە جەنگی شەیتان لەویٚ یە وهەر لەوێشە ئاڵاکەی دەچەسپێنێت و جێگری دەکات) چونکە بازارەکان شوێنی فێل و درۆ وخەڵەتاندن وسوێند خواردنی درۆیە شوێنی سەیر کردنی حەرامە هەموو ئەمانەش لە هاندان و کاری شەیتانی نەفرینکراوە .

(نهي أن يُبالَ في الجُحرِ قالَ قالوا لقتادةَ ما يُكرَهُ منَ البَولِ في الجُحرِ قالَ كانَ يُقالُ إنَّها مَساكنُ الجنِّ) (الصحيح المسند ٥٧١) واتە: پێغمبەری خودا نەهی کردوە میز بکرێتە کونی زیندەوەران.پرسیاریان کرد لەقتادە بۆچی پێغمبەری خودا نەهی کردووە کە مێز بکرێتە ئەو کونەی زیندەوەران دەی کەن.گوتی .دەگوترێت شوێنی نیشتەجێبوونی جنۆکەیە.

وەهەروەها ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەوشوێنانەی کەنیوەی خۆرەو نیوەکەی تری سێبەرە شوێونی دانیشتنی شەیتانە .عن أبي هريرة- رضي اللهُ عنهُ (أنهُ قال: إذا كان أحدُكمْ في الفيءِ،فقلصَ عنهُ، فصار بعضُهُ في الشمسِ" فلْيقُمْ" فإنهُ مجلسُ الشيطانِ) (صحيح الترغيب-٣٠٨٤)

واتە: ئەگەرکەسێك لەسێبەریكدا بوو خۆرهاتە سەریدا نیوەی کەوتە بەر خۆر و نیوەکەی تری لە بەر سیبەر مایەوە، ئەوە بالەو شوێنە هەستیت چونکە ئەوە شوێنی دانیشتنی شەیتانە..

هەندێ لەجنۆکەی مسولْمان لە ئاوەدانی و شارەکاندا دەژین بەبەڵگەی ئەم فەرموودە: (إِنَّ بِالْمَدِينَةِ جِنًّا قَدْ أَسْلَمُوا، فَإِذَا رَأَيْتُمْ مِنْهُمْ شَيْئًا فَآذِنُوهُ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ، فَإِنْ بَدَا لَكُمْ بَعْدَ ذَلِكَ فَاقْتُلُوهُ، فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ)(مسلم-٢٢٣٦) فەرمووی: (مەدینە کۆمەڵێ جنۆکەی تیایە موسڵمان بوون ئەگەر شتێکتان لەوان بەدی کرد ئەوە ئاگاداریان بکەن تا سێ ڕۆژ مۆڵەتیان بدەن دوای ئەوە ئەگەر بەرچاوتان کەوت بیانکوژن چونکە ئەوە شەیتانە.

بەبەڵگەی ئەم فەرموودە جنۆکەو شەیتان لەماڵەکاندا نیشتەجێ دەبن ئەگەر زیکرو یادی خودای گەورەی تیادا نەکریت:(إذا دخلَ الرَّجُلُ بيتَه فذكرَ اللهَ عزَّ و جلَّ عندَ دُخولِه و عِندَ طعامِه " قالَ الشَّيطانُ : لا مَبيتَ لكُم و لا عَشاءَ،ذا دخلَ فلَم يذكرِ اللهَ عِندَ دخولِه ، قالَ الشَّيطانُ : أدرَكتُم المبيتَ ، و إنْ لَم يذكرِ اللهَ عندَ طعامِه ، قالَ الشَّيطانُ : أدرَكْتُم المبيتَ و العَشاءَ) (صحيح مسلم٢٠١٨) واتە:ئەگەر پیاوێك هاتەوە و لەکاتی چونە ماڵەوە و لەکاتی دەستی کردن بە خواردن ناوی خودای هێنا، ئەوە شەیتان دەڵێت: نەخواردن نەشەومانەوەتان لێرەدا بۆنەما. بەڵام ئەگەر لە کاتی هاتنە ژورەوە ناوی خوای نەهینا، دەڵێت: ئیرە شوێن و جیتانە، ئەگەرکاتی خواردنیش ناوی خودای نەهێنا، ئەوە دەڵێت لێرە شوێنی مانەوەو خۆراکتانیش دەست کەوت.جابر کوڕی عبدالله(خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)فەرمووی: (إِذَا كَانَ جُنْحُ اللَّيْلِ –أَوْ أَمْسَيْتُمْ- فَكُفُّوا صِبْيَانَكُمْ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَنْتَشِرُ حِينَئِذٍ، فَإِذَا ذَهَبَ سَاعَةٌ مِنَ اللَّيْلِ فَخَلُّوهُمْ، وَأَغْلِقُوا الْأَبْوَابَ، وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَفْتَحُ بَابًا مُغْلَقًا، وَأَوْكُوا قِرَبَكُمْ وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ، وَخَمِّرُوا آنِيَتَكُمْ وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ، وَلَوْ أَنْ تَعْرُضُوا عَلَيْهَا شَيْئًا، وَأَطْفِئُوا مَصَابِيحَكُمْ) (البخاری -٣١٠٦)

(ئەگەر تاریکایی شەو داهات -یان ئێوارەتان بەسەردا هات منداڵەکانتان قەدەغە بکەن لە چوونە دەرەوە، چونکە شەیتان لەوکاتەدا بڵاوە دەکات، هەر کە سەعاتێ لەشەو تێپەڕی وازیان لێبێنن، دەرگاکانتان داخەن و ناوی خوا بهێنن، چونکە شەیتان ناتوانێ دەرگای داخراو بکاتەوە، هەروەها دەمی کوندە و مەشکەکانتان ببەستن و ناوی خوا بهێنن، دەفرەکانتان داپۆشن و ناوی خوا بهێنن، باشتێکیشتان دابیت بەسەریدا، چراکانیشتان بکوژێننەوە.

پ٨/جنۆکە دەمرن و زیندوو دەکرێنەوە پرسیاریان لێ دەکرێت وسزاو پاداشت دەدرێنەوە؟

وڵام/ خودای گەورە دەفەرموێت: (فِي أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِنْ قَبْلِهِمْ مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ) (الأحقاف -١٨)
واتە: هەر بەدەردی ئومەت و گەلانی پێشین لە جنۆکەو مرۆڤ لەسەریان کەوت.

ئەم ئایەتە بەڵگەیە جنۆکەش وەك مرۆڤ جیل لەدوای جیل دەمرن.جیلێکی تر دێتە جێگەیان
(تفسیر روح المعانی -٢١/٢٦)

بێگوومان جنۆکەش وەکو هەموو بونەوەرەکانی تر ئەوانیش دەمرن بەبەڵگەی ئەم ئایەتە : (كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ) (الرحمن-٢٦) واتە: هەموو ئەو کەسانەی لەسەر ڕووی زەوین، هەر هەمووی دەفەوتێن و تیادەچن و دەبێت بمرن.

پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (أَعُوذُ بعِزَّتِكَ، الذي لا إلَهَ إلَّا أنْتَ الذي لا يَمُوتُ، والجِنُّ والإِنْسُ يَمُوتُونَ) (صحيح البخاری-٧٣٨٣) (مسلم- ٢٧١٧)

واتە: خودایە پەنا دەگرمە عزەت ودەستەڵاتی بێ سنوری تۆ. کەهیچ پەراستراوێك نیە جگە لەتۆ هەرتۆی هەمیشە زیندوی و نامری، جنۆکەو مرۆڤەکان هەرهەموویان دەمرن)

ئبن ئەبی حاتەم دەیگێڕێتەوە کە ئبن عەباس دەڵێت : لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا (قَالَ رَبِّ فَأَنْظِرْنِي إِلَي يَوْمِ يُبْعَثُونَ) (الحجر-٣٦) واتە (ئیبلیس) وتی: ئەی پەروەردگاری مەودام بدە تارۆژی خەڵکی زیندوو دەکرێنەوە..( واتە مەبەستی ئەوەبوو مردن هەرنەچێژێت) خودای گەورەش لەوەڵامدا فەرمووی (قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ الْمُنْظَرِينَ* إِلَي يَوْمِ الْوَقْتِ الْمَعْلُومِ) ( الحجر-٣٧ -٣٨) واتە: دەتۆ لە مۆڵەتدراوانیت تا ڕۆژی دیاریکراو بۆ لەناوچوونی هەموو گیانلەبەران، واتە: ڕۆژی (نەفخەی یەکەم) واتە ئبلیس چل ساڵ دەمرێت تا نەفخەی دووەم. (تفسير الدر المثور- سورة الحجر)

چونکە فوکردن بە شەیپور دا دووجار ڕوودەدات جارێك بۆ مردنی هەموو زیندەوەرانەو جارێك بۆزیندووکردنەوەیانە. پێغمبەر(صلى الله عليه وسلم)دەفەرمویت: (مابيْنَ النَّفْخَتَيْنِ أرْبعُونَ) (صحيح البخاري-٢٩٣٥)(مسلم-٢٩٥٥) واتە: لەنێوان هەردوو نەفخەکە چلە. لایەنگری (النووي والبغوي والطبري والقرطبي والشوكاني والألوسي وابن الجوزي ) بۆ ئەوەیە کە مەبەست لەم فەرموودە چل ساڵە.

جنۆکەکانیش زیندودەکرێنەوە وەکو مرۆڤەکان ئەوانیش پرسیاریان لێ دەکریت خودای گەورە دەفەرمویێت: ( يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِنْكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِي وَيُنْذِرُونَكُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَاۚ قَالُوا شَهِدْنَا عَلَيٰ أَنْفُسِنَاۖ ) (الأنعام-١٣٠) واتە: لە (ڕۆژی قیامەتدا خودا دەفەرمویێت): ئەی دەستەی پەری(جنۆکە) و ئینسان، ئایا پێغەمبەرانتان لە خۆتان بۆ نەهات؟ کە ئایەتەکانی من و ڕووداوەکان بەسەرتاندا بخوێننەوە و ئاگادارتان بکەن و بتانترسێنن لەوەی کە ئەم ڕۆژەتان بۆ پێش دێت؟! (هەموو بەیەکدەنگ) دەڵێن: ڕاستە ئێمە خۆمان شایەتی لەسەر خۆمان دەدەین.

هەروەوەها ئەم ئایەتەش بەڵگەیە لەسەرئەوەی کە جنۆکەش وەکو مرۆڤ پاداشت و سزاش دەدەریت لەڕۆژی دوایدا (لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ) (هود-١١٩) واتە: دەبێ دۆزەخ پڕ بکەم لە جنۆکەو مرۆڤ،ئەوانەیان کەشیاوی ئاگرن.

پ٩/ ئایە جنۆکە پێغمبەریان بۆ هاتووە لە خودی خۆیان؟

وڵام/ خودای گەورە دەفەرمویێت ( يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِنْكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِي وَيُنْذِرُونَكُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا ۚ قَالُوا شَهِدْنَا عَلَىٰ أَنْفُسِنَا ۖ ) (الأنعام-١٣٠) واتە: لە(ڕۆژی قیامەتدا خودا دەفەرموێت): ئەی دەستەی پەری(جنۆکە) و ئینسان، ئایا پێغەمبەرانتان لە خۆتان بۆ نەهات؟، کە ئایەتەکانی من و ڕووداوەکان بەسەرتاندا بخوێننەوە و ئاگادارتان بکەن و بتانترسێنن لەوەی کە ئەم ڕۆژەتان بۆ پێش دێت؟! (هەموو بەیەکدەنگ) دەڵێن: ڕاستە ئێمە خۆمان شایەتی لەسەر خۆمان دەدەین.

هەندێك ئەم ئایەتە کە دەکەنە بەڵگە کە جنۆکە پێغەمبەریان لەخودی خۆیان بۆ هاتبێت ئەمەڕای(مقاتل و الضحاك)وەکو ئەوەی کە ئبن جریرلەتەفسیرەکەیداهێناویێتی.(جامع البيان-١٢/١٢١)

ئبن حزم دەڵێت: بەدڵنیاییەوە پێغەمبەریان بۆ هاتووە لە خودی خۆیان .(المحلي-٧/٤٩٤)

هەندێکی دیکە دەڵێن ئەو ڕایە ڕەد دەکرێتەوە بە پشت بەستن بەم بەڵگانە و دەڵێن هەموو پێغەمبەران لە مرۆڤن و ئەو پێغەمبەرانەی بۆ مرۆڤ هاتونە بۆ (جنۆکە)ش بوونە.

ئبن کثیر دەڵێت : (يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِنْكُمْ) (الأنعام-١٣٠) مەبەستی لە کۆی هەردوو ڕەگەزەکە پێغەمبەرتان بۆ هاتووە لە یەکێك لەڕەگەزەکە پێغەمبەر هاتووە ئەوەکەی دیکەش بڕوای پێ هێناوە لەمرۆڤ پێغەمبەر هاتووە و جنۆکەش بڕوای پێ هێناوە.(تفسير القرآن العظيم-٧/٣٠٢)

(فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْا إِلَى قَوْمِهِمْ مُنْذِرِينَ) (الأحقاف -٢٩) واتە: جا کە (قورئان خوێندنەکە) تەواو بوو هەموو گەڕانەوە بۆ لای قەوم و هۆزەکەیان بە ترسێنەر. (واتا ئەو کەسەی گەلەکەی دەترسێنێت لە سزای خودا)

ئبن کثیر ئەم ئایەتە دەکات بەڵگە کە جنۆکە پێغەمبەریان لە خۆیان بۆ نەهاتووە. بە ڵام بانگ خواز یان تیادابووە گەلەکەیان ترساندووە لەسزای خودا. (تفسیر القرآن العظیم- ٣٠٢/٧).

زۆربەی موفەسیرەکانی قورئان ئەم گوتەیانە هەڵبژاردووە سەیری ئەم سەرچاوانەبکەن ( مفاتیح الغیب (١٦٠/١٣)البیضاوي (٤٥٣/٢)،البحر المحیط (٢٢٥/٤)(زاد المسیر "١٢٥/٣)(أضواء البیان (٤٩٣/١)

پرسیار کرا لەشێخ ابن عثیمین ئایە جنۆکە پێغەمبەریان بۆ هاتووە لە خودی خۆیان فەرموی نەخێرچونکەبەبەڵگەی ئەم ئایەتە (وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا وَإِبْرَاهِيمَ وَجَعَلْنَا فِي ذُرِّيَّتِهِمَا النُّبُوَّةَ وَالْكِتَابَ(الحدید-٢٦) (واتە:بەڕاستی نوح و ئیبراهیممان نارد بۆلای هۆزەکانیان و پێغەمبەرێتیی و کتێبمان دا بەنەوەکانیان) چونکە جنۆکە لە نەوەی نوح و ئیبراهیم نین، بۆیە پێغمبەریان لەخودی خۆیان بۆ نەهاتووە.

پ١٠/ جنۆکە وشەیتان ئێمە دەبینن بەڵام ئێمە ئەوان نابینین؟

وڵام/ ئەوان ئێمە دەبینن بەڵام ئێمە ئەوان نابینین خودای گەورە دەفەرموێت: ( إِنَّهُ يَرَاكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُ مِنْ حَيْثُ لاَ تَرَوْنَهُمْ ) (الأعراف: ٢٧) واتە: وشیاربن لەشەیاتینەکان.چونکە هەمیشە خۆیان و کۆمەڵەو دەستەو بەستەیان ئێوە دەبینن، بەڵام ئێوە ئەوان نابینن.

پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم)دەفەرموێت: (سَتْرُ مَا بَيْنَ أَعْيُنِ الْجِنِّ وَعَوْرَاتِ بَنِي آدَمَ إِذَا وَضَعَ أَحَدُهُمُ ثَوْبَهُ أَنْ يَقُولَ : بِسْمِ اللَّهِ) (صحيح سنن الترمذي رقم ٦٠٦) واتە : پەردەی نێوان چاوی جنۆکە و عەورەتی ئادەمیزاد ئەوەیە لە کاتێکدا جلەکانی دادەکەنیت بڵێت: (بِسْمِ اللَّهِ)

ئەگەرچی ئێمە جنۆکە نابینین، بەڵام گیانلەبەرانی دیکە هەن دەیانبینن وەکو گوێدرێژو سەگ. پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم)دەفەرموێت: (إذا سِمعْتُمْ نُباحَ الكِلابِ، ونَهيقَ الحُمُرِ باللَّيلِ، فتعوَّذوا باللهِ" فإنَّهُنَّ يَرَيْنَ ما لا تَرَوْنَ) (تخريج شرح السنة ١٢٧/٥ صححة شعيب الأرناووط)

.واتە: ئەگەر گویتان لەوەڕینی سەگ بوو،یاخود بەشەوگویتان لەسەرەی گوێدرێژبوو،پەنابگرن بەخودا لەشەیتان،چونکە ئەوان شتانێك دەبینن کەئێوەنایبینن،ئەمەش شتیکی نامۆنیە،چونکە زانایان سەلماندویانەکەهەندێك گیانەوەرتوانای دیتنی شتی وایان هەیەکە ئیمەنایانبینین. بۆنمونەمێشهەنگ تیشکی سەرەووەنەوشەیی دەبینێت، هەر بۆیەئەگەرهەوریش بێت دەتوانی خورببینێت،کوندەبوش لەجەرگەی تاریکی شەودا مشکێك بەدی دەکا.

(عالم الجن والشياطين لسليمان لأشقر-١٦)

پ١١/ ناوی جنۆکە لەچیەوە هاتووەو چەند ناو وچەند جۆریان هەیە؟

وڵام/ناوی جنۆکەلە(اجتنان)وەهاتووە کە مانای ونبون لەبەرچاو نەمان دێت.(لسان العرب ج١٣/١١٢)

ئیبنی عەبدولبەڕ دەڵێت: جنۆکە لە لای زمانزانانی عەرەب چەند ناوێکیان هەیە:

١) ئەگەر بەرەهایی مەبەستیان جنۆکە بێت، پیٚ ی دەڵێن (جني)

٢)ئەگەر مەبەستیان ئەوانەبن کە هاونشینی مروڤن، پیٚ ی دەڵێن (عامر)بەکۆمەڵێکیش لەوانە دەوترێت(عمار).

٤)کەباسی ئەوانە دەکەن کەبەگژ منداڵاندا دێن،پێ ی دەڵێن ( أرواح).

٥)ئەگەر پیس و ناپاك بوون و بەگژ خەڵکیشدا چون، پێ ی دەڵێن (شیطان).

٦)ئەگەر زیاتریش بەهیزتربوو،پێ ی دەڵێن (عفریت). (فتح المالك بترتيب التمهيد لابن عبد البر علي موطأ الإمام مالك ج١٠/٤٥)

پێغەمبەری خودا(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (الجِنُّ ثلاثةُ أصنافٍ " فصنفٌ لهم أجنحةٌ يطيرون بها في الهواءِ ، وصِنفٌ حيَّاتٌ و كلابٌ ، و صِنفٌ يحِلُّون و يظْعَنون) (صحيح الجامع٣١١٤ )

واتە: جنۆکە سێ جورن : جوریێکیان باڵیان هەیە بە هەوادا دەفڕن، جۆرێکیان مارو سەگن و، جۆرێکیشیان دێن و دەچن، نیشتە جێ دەبن و گەشتیش دەکەن.

پ١٢/ جنۆکە دەخۆن ودەخۆنەوە؟

وڵام/ جنۆکە دخۆن و دەخۆنەوە، لە سەحیحی بوخاریدا لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە :

(..... يا أبا هُرَيرةَ ابْغِنِي أحْجَارًا أسْتَنْفِضْ بهَا، ولَا تَأْتِنِي بعَظْمٍ ولَا برَوْثَةٍ. فأتَيْتُهُ بأَحْجَارٍ أحْمِلُهَا في طَرَفِ ثَوْبِي، حتَّي وضَعْتُهَا إلي جَنْبِهِ، ثُمَّ انْصَرَفْتُ حتَّي إذَا فَرَغَ مَشيتُ، فَقُلتُ: ما بَالُ العَظْمِ والرَّوْثَةِ؟ قالَ: هُما مِن طَعَامِ الجِنِّ..وإنَّه أتَانِي وفْدُ جِنِّ نَصِيبِينَ، ونِعْمَ الجِنُّ، فَسَأَلُونِي الزَّادَ، فَدَعَوْتُ اللَّهَ لهمْ أنْ لا يَمُرُّوا بعَظْمٍ،ولَا برَوْثَةٍ إلَّا وجَدُوا عَلَيْهَا طَعَامًا)(صحيح البخاري ٣٨٦٠)

واتە: پێغەمبەری خودا(صلى الله عليه وسلم) فرمانی پێکرد چەند بەردێکی بۆبێنی تاراتی پێ بکات، پێی فەرموو: نە ئێسك و نەریخ(تەرسەقوڵ)م بۆ مەهێنە.لەدوای ئەوەی لەکارەکەی بوەوە وکەوتینەرێ پرسیارم کرد لەهۆکاری بەکارنەهێنانی ئێسك وتەرسەقول ؟ فەرموی: ئەوانە خوراکی جنۆکانن. چونکە وەفدێکی جنۆکەکانی ناصیبین هاتنە لام کەچاکترینی جنۆکانن،

داوای ئازوقەو بژێویان لێکردم، منیش لە خودا پاڕامەوە .کە بەسەر هەر ئێسك و ریخێك(تەرسەقولێك)دا تێپەربن خوراکی بو ئەوانی لە سەربێت)

لەفەرمودەیەکی تردا پێغەمبەری خودا(صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: (لا تستنْجُوا بالرَّوْثِ ، ولا بالعِظامِ ، فإنَّهُ زادُ إخوانِكمْ من الجِنِّ ) بەریخ(تەرسەقول) و بە ئێسك تارات مەکەن خۆتان پاك مەکەنەوە چونکە ئەوە خۆراك بژێوی براکانتانن لە جنۆکە(صحيح الجامع ١٠٦).

لەفەرمودەیەکی تردا پێغەمبەری خودا(صلی الله علیه وسلم)دەفەرموێت: (أتاني داعِي الجِنِّ فَذَهَبْتُ معهُ فَقَرَأْتُ عليهمُ القُرْآنَ قالَ: فانْطَلَقَ بنا فأرانا آثارَهُمْ وآثارَ نِيرانِهِمْ وسَأَلُوهُ الزَّادَ فقالَ: لَكُمْ كُلُّ عَظْمٍ ذُكِرَ اسْمُ اللهِ عليه يَقَعُ في أيْدِيكُمْ أوْفَرَ ما يَكونُ لَحْمًا وكُلُّ بَعْرَةٍ عَلَفٌ لِدَوابِّكُمْ. فقالَ رَسولُ اللهِ (صلی الله علیه وسلم): فلا تَسْتَنْجُوا بهِما فإنَّهُما طَعامُ إخْوانِكُمْ) (مسلم-٤٥)

واتە: بانگێژی جنۆکەکان هاتە لام و منیش لە گەڵی چووم و قورئانم بەسەردا خوێندن، دەڵی جا پێغەمبەر ئێمەی برد جێ پێ و شوێنی ئاگری ئەوانی پیشان داین، ئەوجا داوای بژێوی خۆراکیان کردبوو، ئەویش فەرمووی: هەموو ئێسکێك بۆ ئێوەیە کە ناوی خودای لە سەر هاتبوو بەگۆشتێتی لەوکاتەدا بۆ ئێوە گۆشتی پێوەیە.دوای فەرمووی بەریخ(تەرسەقول) و بەئێسك تارات مەکەن وخۆتانی پێ پاك مەکەنەوە چونکە ئەوە خۆراکی براکانتانن لە جنۆکە.

لەسەر شێوازی خواردنیان شەیتان بە دەستی چەپی دەخوا، پێغەمبەری خودا(صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت :(إذا أكَلَ أحَدُكُمْ فَلْيَأْكُلْ بيَمِينِهِ، وإذا شَرِبَ فَلْيَشْرَبْ بيَمِينِهِ فإنَّ الشَّيْطانَ يَأْكُلُ بشِمالِهِ، ويَشْرَبُ بشِمالِهِ) (صحيح مسلم ٢٠٢٠)

واتە: ئەگەر یەکێکتان خواردنێکی خوارد بابە دە ستی راست بیخوات، ئەگەر شتێکی خواردەوە بە دەستی ڕاست بخواتەوە، چونکە شەیتان بە دەستی چەپ دەخواو بە دەستی چەپیش دەخواتەوە.

لەفەرمودەیەکی تردا پێغەمبەری خودا(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (إذا دخلَ الرَّجُلُ بيتَه فذكرَ اللهَ عزَّ و جلَّ عندَ دُخولِه و عِندَ طعامِه " قالَ الشَّيطانُ : لا مَبيتَ لكُم و لا عَشاءَ ، إذا دخلَ فلَم يذكرِ اللهَ عِندَ دخولِه ، قالَ الشَّيطانُ : أدرَكتُم المبيتَ ، و إنْ لَم يذكرِ اللهَ عندَ طعامِه ، قالَ الشَّيطانُ : أدرَكْتُم المبيتَ و العَشاءَ) (صحيح مسلم٢٠١٨ )

واتە: ئەگەر پیاوێك هاتەوە و لەکاتی چونە ماڵەوە و لەکاتی دەستی کردە خواردن ناوی خوای هێنا، شەیتان دەڵێت: نەخواردن نە شەومانەوەتان لێرەدا بۆنەما، بەلام ئەگەر لە کاتی هاتنە ژورەوە ناوی خوای نەهینا،دە لێت: ئیرەشوین وجیتانە وئەگەرکاتی خواردنیش ناوی خوای نەهێنا،شوینی مانەوە وخۆراکتانیش دەست کەوت

ئەم دەقانەش بەڵگەن بۆ ئەوەی کەشەیتانەکان دەخۆن و دەخۆنەوە جا چون مرۆڤ نەهییان لێ کراوە گوشتێك بخۆن ناوی خوای لە سەر نە هاتبێ، جنۆکە ئیماندارەکانیش ئاوا، پێغەمبەری خودا(صلى الله عليه وسلم) هەموو ئێسکێکی بۆ کردنە خۆراك کە ناوی خودای لە سەر هاتبێت، ئەوەی بۆ بەدروست دانەناون کە ناوی خودایان لە سەر نە هاتووە ئەوەی (بسم الله) شی لەسەر نەکرابێت بۆجنۆکەی کافرو شەیتانەکانی ترن ، چونکە شەیتان ئەو خواردنە بە حەلال دەزانن کاتێك ناوی خودای لە سەر یاد ناکرێ، هەرلە بەرئەوەیە هەندێ لە زاناکان وای بۆدەچن کە مردارەوەبوو خوراکی شەیتانە، چونکە ناوی خودای لەسەر نەهاتووە.

خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ) (المائدة-٩٠) واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بێگومان ئارەق و قومار و ئەو بەردانەی کە کراون بە بت و ئەو پارچە

دارانەی( کە بەکارئەهێنرێن بۆ دیاری کردنی بەش و چارەنووس) ئەوانە پیسن و لە کردەوەی شەیتانن کەواتە دوور کەونەوە لیێ ی تا ڕزگاربن.

ئیبن قەیم: لە بابەتی ئەم ئایەتە بڕوای وایە خواردن و خواردنەوی شەیتانەکانە، چونکە شەیتان خۆی لەوخواردن و خواردنەوانە دەخوات ودەخواتەوە کە بە فەرمانی خۆی دروستی دەکەن ،چۆن لەدروست کردنەکەی بەشدار دەبیت ئاواش بە شدار دەبێ لەخواردن و خواردنەوەی وگوناھ و سزاکەشی.

پ١٣/ بڕوانەبوون بەبوونی جنۆکەخاوەنەکەی لەدین دەردەکات،یاخود دەی باتە ڕیزی ئەوکەسانەی کەلەدین هەڵگەراونەوەتەوە؟

وڵام / بێ گومان باوەڕ بوون بەجنۆکە یەکێکە لە بابەتە گرنگەکانی بیر و باوەڕی مسوڵمان ،و نابێ نکوڵی لیێ بکرێت چوونکە ئەبێ مسوڵمانان باوەڕی تاواویان هەبێت هەبێ پیێ ی چونکە لەشتە غەیب و نادیارکانە باوەڕ بوون بە شتەغیب و نادیارەکان یەکێکە لە سیفاتی باوەڕداری تەواو،هەروەکو پەروەردگاردەفەرموێت : ( الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ ) (البقرة-٣) واتە:ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هەیە بە غەیب ، نوێژەکانیان بە جوانی ئەنجام ئەدەن وەلەوەی پێمان بەخشیون ئەیبەخشن.

خودای گەورە لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت: (وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوا أَنْصِتُوا فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْا إِلَى قَوْمِهِمْ مُنْذِرِينَ) (الأحقاف -٢٩)

وە (بیریان خەرەوە) کاتێ چەند جنۆکەیەکمان نارد بۆ لات تا گوێ لە قورئان بگرن جا کاتێ ئامادەی گوێ گرتن لە قورئان بوون وتیان (بە یەکتری) بێ دەنگ بن (و گوێ بگرن) جا کە

(قورئان خوێندنەکە) تەواو بوو هەموو گەڕانەوە بۆ لای قەوم و هۆزەکەیان بە ترساندنیان ، دەستیان کرد بەئاگادارکردنەوەو بانگکردنیان بۆ پەیرەوی کردنی ئەم ئاینە نوێیە.

لەفەرمودەیەکدا کە ئیمامی موسلم ڕوایەتی کردووە: (عَنْ عامِرٍ، قالَ: سَأَلْتُ عَلْقَمَةَ: هلْ كانَ ابنُ مَسْعُودٍ شَهِدَ مع رَسولِ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) لَيْلَةَ الجِنِّ؟ قالَ: فقالَ عَلْقَمَةُ: أنا سَأَلْتُ ابْنَ مَسْعُودٍ فَقُلتُ: هلْ شَهِدَ أحَدٌ مِنكُم مع رَسولِ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) لَيْلَةَ الجِنِّ؟ قالَ: لا، ولَكِنَّا كُنَّا مع رَسولِ اللهِ ذاتَ لَيْلَةٍ ففقَدْناهُ فالْتَمَسْناهُ في الأوْدِيَةِ والشِّعابِ. فَقُلْنا: اسْتُطِيرَ أوِ اغْتِيلَ. قالَ: فَبِتْنا بشَرِّ لَيْلَةٍ باتَ بها قَوْمٌ فَلَمَّا أصْبَحْنا إذا هو جاءٍ مِن قِبَلَ حِراءٍ. قالَ: فَقُلْنا يا رَسولَ اللهِ، فقَدْناكَ فَطَلَبْناكَ فَلَمْ نَجِدْكَ فَبِتْنا بشَرِّ لَيْلَةٍ باتَ بها قَوْمٌ. فقالَ: أتانِي داعِي الجِنِّ فَذَهَبْتُ معهُ فَقَرَأْتُ عليهِمُ القُرْآنَ قالَ: فانْطَلَقَ بنا فأرانا آثارَهُمْ وآثارَ نِيرانِهِمْ ) (مسلم-٤٥٠ )

واتە: لەعامرەوە دەڵێت پرسیارم کرد لە عەلقەمە ئایە عبدالله کوڕی مەسعود لەگەڵ پێغەمبەردا ئامادەبوو لەشەوی جنۆکەکاند ،عبدالله کوڕی مسعود (خوایی لیٚ ڕازی بێت)ئەفەرمیٚ نەخێر بەڵام لەگەل پێغەمبەری خوا بووین (صلى الله عليه وسلم) شەوێکیان لیٚمان بزر بوو ، گەڕاین بەدوایدا لە دۆل و شیوەکاندا ،وتمان لەوانەیە کوژرابێت ، یان شتێکی خراپی بەسەردا هاتبیٚ ، ئەو شەوەمان بردە سەر بەڵام ناخۆش ترین شەو بوو ، کاتێك ڕۆژ بووەوە بینیمان دەرکەوت لەلایی ئەشکەوتی (حراء) وە ، ئەفەرمیٚ وتمان ئەیی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەم شەو بزر بووی و گەڕاین بە دواتدا نەتمان بینیەوە ، بەڕاستی ئەم شەو ناخۆشترین شەوبوو بەسەرمان برد ، فەرمووی بانگ کەری جنۆکەکان هات بۆلام و منیش ڕۆیشتم لەگەڵیدا ، قورئانم خوێندەوە بەسەریاندا ،ئەفەرمیٚ بردمانی بۆ ئەو شوێنەیی کە قورئانی بەسەریاندا خوێندبووەوە ،پاشماوەیی ئاگرەکەشیانمان بینی)

بەڵگەی تر زۆرە لە قورئان و سوونەتدا بۆکەسێك دوای ڕاستی بکەوێت بوێ ئەوەندە بەسە بۆئەوەی کەبونیان هەیەو ڕاستین پێویستە هەموو باوەڕداریێ بڕوای پێیان هەبێت چونکە خودای پەروەردگار سورەتێکی داناوە بەناوی (الجن) ەوە. ووتەی ئەو کەسانەی کەهەبونی جنۆکە ڕەت دەکەنەوە ئەوە یەکە هیچ دەربارەی هەبونیان نازانن ،نەزانینیش بەڵگە نییە لەسەر نونیان. بۆکەسانی ژیر وهۆشمەندیش ناشرینە شتێك ڕەت بکاتەوە کەزانیاری وشارازایی دەربارەی نیە..ئەم سیفەتە سیفەتی بیێ باوەڕەکانە. (بَلْ كَذَّبُوا بِمَا لَمْ يُحِيطُوا بِعِلْمِهِ )(يونس- ٣٩)

واتە: بەڵکو ئەوانە بڕوایان بە قورئان نەهێناو بە درۆیان دانا کە هیچ زانیارییان دەربارەی نەبوو. ئایە دەبوو کەسێك سەدان سال پێش ئیستا ژیابێ باوەڕی بەم داهێنراوە نویێ یانە ئیستا نەکردبایە ئەگەر کەسێکی ڕاستگۆ ئەم هەواڵەی پیێ بدایە؟

پ/ شوبهەوگومانێك لای هەندیێ خەڵك دروست بوو لەسەر ئەو ووتەی ابن عباس کە گوایە نکۆڵی کردبێت لەوەی کەپێغمبەری خودا لەگەڵ جنۆکە گوفتارو ووتو وێژی کردبێت ؟

ما قرأ رسولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم)علي الجنِّ وما رآهم ، انطلق رسولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) في طائفةٍ من أصحابِه عامدين إلي سوقِ عُكاظٍ ، وقد حِيل بين الشَّياطينِ وبين خبرِ السَّماءِ ، وأُرسِلتْ عليهم الشُّهبُ ، فرجعت الشَّياطينُ إلي قومِهم ، فقالوا : ما لكم ؟ قالوا : حِيل بيننا وبين خبرِ السَّماءِ ، وأُرسِلتْ علينا الشُّهبُ ، قالوا : ما حال بينكم وبين خبرِ السَّماءِ إلَّا من أمرٍ حدث ، اضرِبوا مشارقَ الأرضِ ومغاربَها ، فانظُروا ما هذا الَّذي حال بينكم وبين خبرِ السَّماءِ ، انطلَقوا مشارقَ الأرضِ ومغاربَها يبتغون ما حال بينهم وبين خبرِ السَّماءِ ، انصرف أولئك النَّفرُ الَّذين توجَّهوا نحوَ تِهامةَ إلي رسولِ اللهِ(صلى الله عليه وسلم)، وهو وأصحابُه بنخلةٍ عامدين إلي سوقِ عُكاظٍ ، وهو يُصلِّي بأصحابِه صلاةَ الفجرِ ، فلمَّا سمِعوا القرآنَ استمعوا قالوا : هذا واللهِ الَّذي حال

بينكم وبين خبرِ السَّماءِ ، فهنالك حين رجعوا إلي قومِهم ،فقالوا :إنَّا سمِعنا قرآنًا عجَبًا،يَهدي إلي الرُّشدِ فآمنَّا به ولن نُشرِكَ بربِّنا أحدًا،فأنزل اللّهُ عزَّ وجلَّ علي نبيِّه (صلى الله عليه وسلم):قُلْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ اسْتَمَعَ نَفَرٌ مِنَ الْجِنِّ وإنَّما أُوحِي إليه قولُ الجنِّ)(مسلم- ٢٠٨١)(البخاري- صفةالصلاة-٧٣٩)

(ئبن عباس) (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەی خوێندووە بەسەر جنۆکەدا، نەشیدیون، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ چەند هاوەڵێکیدا چوون بۆ بازاڕی (عطاظ)، لەوکاتەدا ڕێگری کرابوو لە شەیتانەکان کە هەواڵی ئاسمان بزانن و نەیزەك (شهب)یان تێدە گیرا، بۆیە شەیتانەکان گەڕانەوە بۆ ناو قەومەکەیان و، قەومەکەیان وتیان: چیتانە؟ وتیان: ڕێگەمان لێگیراوە لە هەواڵی ئاسمان، وتیان دەبێ شتێك ڕوویدابێت، هەر بۆیە خۆر هەڵات و خۆر ئاوای زەوی بگەڕێن بزانن چی ڕێی لێگرتووین، دەستیان کرد بە گەڕان بە خۆرهەڵات و خۆرئاوادا، چەند کەسێکیان بەرەو تەهامە و لەوێوە بۆ بازاری (عطاظ) ڕۆیشتن، لەوکاتەدا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)نوێژی دەکرد بۆ هاوەڵەکانی، نوێژی بەرەبەیان، کاتێ گوێیان لە قورئانەکە بوو، یەکسەر وتیان: ئا ئەمەیە ڕێگای لێگرتووین، گەڕانەوە بۆ ناو قەومەکەیان، وتیان: ئەی قەومەکەمان: (ئێمە قورئانێکی سەیرمان بیست، ڕێنمایی بەرەو کامڵبوون دەکات، ئێمەش ئیمانمان پێ هێنا ئیتر هاوەڵ بۆ پەروەردگارمان پەیدا ناکەین هەرگیز). خوای گەورەش ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)ماناکەی ئەمەیە: (بڵێ: وەحیم بۆ هاتووە کە چەند کەسێك لە جنۆکە گوێیان بۆ قورئان گرتووە )(الجن-١)

بەیهەقی دەڵێت: ووتەی ئبن عەباس کەلەم فەرموودەدا هاتووە، ڕووداوی سەرتای ئیسلام بووە کاتێك پێغەمبەریان ناسی لەوکاتانەدا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) نەیانی بینی بوو ولەگەڵیانیش گفتوگۆی نەکردبوو،بەڵام جارێکی تر نوێنەری جنۆکە هاتنەوە بۆلای،پێغەمبەریش لەگەڵیان

چوو قورئانی خوێند بەسەریاندا وەکو لەفەرموودەکەی ئیبن مەسعودا هاتووە. (فتح الباری شرح صحیح البخاری ج۷/۲۰۸)

پ١٤/ بڕوانەبوون بەچونە ژورەوی جنۆکەو شەیتان بۆجەستەی مرۆڤ خاوەنەکەی بێ باوەڕ نابێت بەڵام دەی خاتە ڕیزی گومڕاو سەرلێ شێواوەکان؟

وڵام / چونە ژوورەوەی جنۆکە وشەیتان بۆ لەشی مرۆڤ بەبەڵگەی قورئان وسونەت جێگیربووە. حوکمی ئەوکەسانەی کە ڕەتی دەکەنەوە کە جنۆکە بچێتە لەشی مرۆڤەوە،بوونی ئەم بڕوایە بەووتەی زانایان خاوەنەکەی بێ باوەڕنابێت،بەهۆی شاراوەیی بەڵگەکان لەم بوارەدا، بەڵام گومراو سەر لێشێواوی دەکات و بەشوێن کەوتووی بیدعە کاران دادەنرێت کە عەقڵ دەدەن بەسەر نەقڵ و بەڵگەدا وەکو موعتەزیلەکان.

شێخ فوزان دەڵێت: ڕەتکردنەوەی هەبوونی جن و بڕوا نەبوون بەهەبوونیان بێ بڕوا بوون و هەڵگەڕانەوەیە لە ئیسلام چونکە بە بەڵگەی قورئان سونەت بەتەواتر بە ئێمە گەیشتووە بڕواهێنان پێ یان بڕواهێنانە بە شتە غەیب و نادیارەکان.( إِنَّهُ يَرَاكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُ مِنْ حَيْثُ لاَ تَرَوْنَهُمْ ) (الأعراف: ٢٧) واتە: وشیاربن لەشەیاتینەکان،چونکە هەمیشە خۆیان و کۆمەڵەو دەستەو بەستەیان ئێوە دەبینن، بەڵام ئێوە ئەوان نابینن.

بەڵام کەسێك بڵێت بڕوام بە جن هەیە بەڵام بڕوام بەوەنیە بچێتە لەشەوە پێ ی کافرنابێت بەڵکو هەڵەیە بەدرۆ خستنەوە ی ئەوبەڵگانە شەرعیانەیە کەوودوپاتی دەکەنەوە کەجن دەچیتە لەشەوە و ئەو ڕوداوانەیە کەلە لەژیانی ڕۆژانەی خەڵکیدا ڕوودەدات، ئەم بابەت نەیارانی پی کافرناکرێت چونکە بۆ ئینکارکردن و قبوڵ نەکردنی ئەم بابەتە پشت بە عەقڵ و هەستی خۆیان دەبەستن نەوەکو دەلیل وبەڵگە. بەڵام عەقل پێوەر نیە بۆ شتە غەیب و

نادیارەکان، لای هیچ کەسێکیش عەقڵ پێش بەڵگەودەلیل ناخرێت مەگەر لای کەسە گومراو سەرلێشیواوەکان نەبێت. (کتاب الفتاوي الشرعيه في المسائل العصريه من فتاوي علماء البلد الحرام١٥٩٧)

شیخ ئبن باز: ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت دەفەرموێت (وإجماع الأمة علي جواز دخول الجني بالإنسي وصرعه، فكيف يجوز لمن ينتسب إلي العلم أن ينكر ذلك بغير علم ولا هدي بل تقليدا لبعض أهل البدع المخالفين لأهل السنة والجماعة، ولا حول ولا قوة إلا بالله) واتە: کۆی زانایان لەسەر ئەوەن جنۆکە دەچێتە ناو لەشی مرۆڤەوە و دەیبورێنێتەوە و شێتی دەکات ، ئینجا چۆن دەکرێت کەسانێك لەوانەی خۆیان بەخاوەنی زانست دەزانن. ئینکاری ئەمە بکەن بەبێ زانیاری وە بێ بەڵگە بەڵکو هاوشێوەی کەسانێکی دەکەن کەداهێنراویان هیناوەتە نێو دینەوە وشوێنی ئەوانە کەوتوون کەپێچەوانەی ئەهلی سوننەت و جەماعەتن. ولا حول ولا قوة إلا بالله (الردود البازية في بعض المسائل العقدية٣٩١)

پ١٥/ دەست لێ وەشاندن لەلایەن جن وشەیتانەوە هۆکارێکە بۆ تێکچونی بیروعەقڵ وهۆش؟

وڵام/خودای گەورەدەفەرموێت:(ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِي يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ مِنَ ٱلۡمَسِّۚ) (البقرة -٢٥٧) واتە: ئەوانەی سوو دەخۆن (واتە: سوو وەردەگرن) حاڵیان وەکو حاڵی کەسێك وایە، کە شەیتان دەستی لێ وەشاندبێت.)

﴿ يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ مِنَ ٱلۡمَسِّۚ ﴾ واتە شەیتان تێکی دەدات (يَتَخَبَّطُهُ)لە (الْخَبْطِ)ەوە هاتووە واتا لێدان و چون ژورەوە ، بەلێدانێکی نارێك نمونەش بۆ ئەمە دەوترێت (نَاقَةٌ خَبُوطٌ) واتە ووشترێکە لەخەڵکی دەدات و بەپێ کانی ودەیان شێلێت. واتە لێدان بە شێوە ی هەرەمەکی . بەجۆرێك کەسەکە ناتوانێت بە شیوەیەکی گونجاو بیربکاتەوەشتەکان لێك جیابکاتەوە چونکە شەیتان دەستی لێ وەشاندوەو تێکی داوەو باری دەرونی جێگیر نیە.

(مِنَ الْمَسِّ) وتا شێتی و تیکچونی باری دەرونی: دەڵێن (مُسَّ الرَّجُلُ) واتە ئەو پیاوە مەمسوسە واتەشێت بوەو باری دەرونی تێکچووە . (تفسير الخازن والبغوي ج١/ ٣٨٤)

(إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِي يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ مِنَ ٱلۡمَسِّۚ) ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر پڕوپوچی ووتە وگوفتاری ئەوکەسانەی کەدەڵێن جنۆکەو شەیتان مرۆڤ تێك نادەن و ناچنە جەستەوە،ئەو ووتەیەیان پوچە کە دەڵێن تێکچونی باری دەروونی تەنهاکارێکی سروشتیە لەمرۆڤدا، هەرگیز بەهۆی چونەژورەوەی جن بۆجەستەی مرۆڤ نابێت، وەدەڵێن ئەوە ڕاست نییە کە عەرەب دەڵێت : جنۆکە و شەیتان مرۆڤ تێك ئەدەن و ئەچنە لەشەوە (چونکە هەر لەکۆنەوە عەرەب بڕوای بەدەست لێوەشاندن و چوونەژوورەوەی جن هەبووە بۆ لەشی مرۆڤ). (فتح البيان- صديق حسن خان ج٢/١٣٩)

پێغەمبەری خودا(صلى الله عليه وسلم) لەفەرمودەیەکدا دەفەرموێت:(وأعوذ بك أن يتخبطني الشيطان عند الموت) (صحة الألباني— صحيح سنن أبي داود١٥٥٢ )

واتە:خودایە پەنات پێ دەگرم لەوەی شەیتان دەسم لێ بوەشێنیت وتێکم بدات لەسەرە مەرگدا.. قاضي دەڵێت : واتە شەیتان بە وەس وەسە و ختورەی تۆشی پێ خلیسکانم بکات بیرو عەقڵ و هۆشم تێك بدات، مەبەستی سەرەکی لەبەکارهینانی ووشەی (التخبط) ئەوەیە کەوشتر بەسووکی دەستی پێدا بکێشێت بیدات بەزەویدا.(عون المعبود شرح سنن أبي داود ج٣/٢٦٠ )

لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا (ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِي يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ مِنَ ٱلۡمَسِّۚ)

ئیبن عباس دەڵێت : واتە: سوو خۆر لەڕۆژی دواییدا لەگۆڕەکانیان هەڵدەسنەوە وەکو کەسێك باری دەروونی تێکچووە وهەست بەخنکان دەکات. (تفسير ابن كثير ج٢/٥٤٦)

پ/ جنۆکەو شەیتان زیان بەمرۆڤ دەگەیەنێت بەتوش کردنی بەوەس وەسە و خەیاڵ ودەست لێوەشاندن توشی کردنی بەپەرکەم؟

وڵام/ (إِنَّ الَّذِينَ اتَّقَوْا إِذَا مَسَّهُمْ طَائِفٌ مِنَ الشَّيْطَانِ تَذَكَّرُوا فَإِذَا هُمْ مُبْصِرُونَ) (الأعراف-٢٠١) واتە: بەڕاستی ئەوانەی خواناس و پارێزگار بوون کاتێك زیان وخەتەر لە(وەس وەسەو تێکدان)یان پێ بگات لەشەیتانەوە،یادی خوا دەکەن و خوایان بیر دەکەوێتەوە جا کوت وپڕ بەرچاویان ڕۆشن دەبێتەوە واتە ڕاستی دەدۆزنەوە.

هەندێ لە مەکیەکان و بەصریەکان و کوفیەکان بە(إِذَا مَسَّهُمْ طَيْفٌ مِنَ الشَّيْطَانِ) دەی خوێننەوە وزانایان ڕایان جیاوازە لەسەرمانای (الطَّيْفُ) و (اَلطَّائِفُ) لەزمان و وتەی عەربدا هەندێ لە کوفیەکان دەڵێن: دەڵێن (الطَّيْفُ) واتایەکی هەیە (اَلطَّائِفُ)واتایەکی تری هەیە (الطَّيْفُ)بەواتای دروست کردنی وەسوەسەو خەیاڵ دێت لە لەلایەن شەیتانەوە دەبێت. (اَلطَّائِفُ) باواتای (مەس)وتێکدانی باری دەرونی دێت . تفسير الطبري ج٦/١٥٥

(إِذَا مَسَّهُمْ طَائِفٌ مِنَ الشَّيْطَانِ) ئیبنوکەسیر لەتەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزەدادەفەرموێت: هەندێك تەفسیریان کردووە بە توڕەیی و هەڵچوون وهەندێك تەفسیریان کردووە بەدەست لێوەشاندی شەیتان وتوشکردنی بەپەرکەم و تێکدانی باری دەروونی)وهاوشێوەی ئەوە، هەندێك بەتوڕەیی و تاوان تەفسیریان کردووە .تفسير ابن كثير ج٣/٤٨٣

(إِذَا مَسَّهُمْ طَائِفٌ مِنَ الشَّيْطَانِ) دەڵێن (الطَّيْفُ) واتایەکی هەیە (اَلطَّائِفُ)واتایەکی تری هەیە یەکەم بەواتای دروست کردنی وەسوەسەو خەیاڵ دێت لە لەیان شەیتانەوە دەبێت، ودووەم باواتای کاریگەری شەیتان خودی خۆی دێت.

مجاهد دەڵێت : بەشێت بوون تێکچونی باری دەروونی و وەسوەسە و تورەییش هەمووی دەوترێت (الطَّيْفُ).لەبەر ئەوەی وەسوەسە لەلایەن شەیتانەوە لەشیوەی چوونە نێو بیرکەردنەوەی قوڵ وخەیاڵ دەبێت. تفسير القرطبي ج٤/ ٢٥٠

سەیری تەفسیری (فتح البیان)ی صدیق حسن خان بکەیت هەمان ووتەی دووبارەکردۆتەوە .
الزجاج دەڵێت: بەشێت بوون تێکچونی باری دەروونی و وەسوەسە و تورەییش هەمووی دەوترێت (الطَّيْفُ).لەبەرئەوەی وەسوەسەیە لەلایەن شەیتانەوەلەشیوەی چونە نێو بیرکەردنەوە وخەیاڵ دەبێت (فتح البيان في مقاصد القرآن ج٢/ ٦٣٨)

(إِذَا مَسَّهُمْ طَائِفٌ مِنَ الشَّيْطَانِ) (الطَّيْفُ) بەواتای وەسوەسە و شێت بوون تێکچوونی باری دەروونی دێت. الازهری دەڵێت: (الطَّيْفُ)لە ووتەی عەرەبدا بە شێت بوون تێکچوونی باری دەروونی دەوترێت. بەیەکێك تورەبێت و هەڵچێت دەوترێت(الطَّيْفُ) چونکە تورەی وەکو شێتی وایە.(تفسير الخازن والبغوي ج٢/٦٣٦)

(إِذَا مَسَّهُمْ طَائِفٌ مِنَ الشَّيْطَانِ) ئەبوعومەرو ئبن العلاء دەڵێت: وەس وەسەیە بەڵام بنەرەت لە وشەی (الطيف) واتای شێتی و تێکچوونی باری دەرونیە. (تفسيرالسمعاني ج٢/ ٧٥)

(النَّزْغُ) سوکترە لە (مَسِّ الطّائِفِ مِنَ الشَّيْطانِ) چونکە (النَّزْغُ) کەمترین جوڵەیە لە شەیتانەوە بەڵام(مَسِّ الطّائِفِ) لێدان و دەست لێ وەشاندنە،توش کردنە بەشێت بوون تێکچوونی باری دەروونیە.(تفسير البحر المحيط- ج٤/٤٤٥)

(إِذَا مَسَّهُمْ طَائِفٌ مِنَ الشَّيْطَانِ) ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە شەیتان دەوریانی داوەو لێیان جیا نابێتەوە وبەدوریاندا دەخولێتەوە هەندێ جار توشی(مَسٌّ) ودەست لێ وەشاندن وتێچکونیان دەکات کەئەمە گەورەترە لە (النَّزْغ) کەتەنها وەس وەسە وخەیاڵیان بۆدروست دەکات، بەهۆی

ئەوەی لە هەمووﻻیەکەوە دەوریانی داوە وەهەندێ جاریش هیچ کاریگەریەکی نابێت لەسەریان. (تفسير البقاعي ج٣/١٧٥)

پ١٦/شەیتان وجنۆکە توانای زاڵبوونیان هەیە بەسەر جەستەی مرۆڤ و توشکردنی بەئازار وئەشکەنجەو جۆرهانەخۆشی؟

وڵام/ خودای گەورە دەفەرموێت:(وَاذْكُرْ عَبْدَنَا أَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الشَّيْطَانُ بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ) (ص -٤١)

واتە: باسی بەندەی ئێمە ئەیوب بکە کاتێ هاواری لە پەروەردگاری کرد (ووتی) بەڕاستی شەیتان تووشی زەحمەت و نارەحەتی و ئازار و ئەشکەنجەی کردووم.

(مَسَّنِيَ) واتە توشی کردووم (الشَّيْطَانُ) شەیتانی جنۆکە (بِنُصْبٍ) زەرەرو زیان (وَعَذَابٍ)ئازار و ئەشکەنجە، شەیتان ئازارێکی زۆری دابوو، بەڵام ئایە ئەو ئازارە ئازاری دەروونی بێت کەوەس وەسەو خەیاڵاتی لەدڵیدا دروست کردبێت وکاری کردووتە سەر جەستەی، یاخود ئەو ئازارە هەستی بێت (بائاشکراهەست بەو بەئازارە بکات لەجەستەیدا) هەندێك دەڵێن کەشەیتان فووی کردبوو بە جەستەیدا، تاوەکو هەموو جەستەی بووتە وەك شێوەی دڕکە مێ کوتە و زیپکەی زیان بەخش. خودای گەورەش زاناترە هەردوو جۆرەکەش هەردەبێت، چی ئازاری دروونی بێت یان ئازای هەستی .( تفسير ابن عثيمين سورة ص- ايه١٤)

(بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ) قتادە دەڵێت: (بِنُصْبٍ) واتە:ئازاروئەشکەنجە لە جەستە(وعَذابٍ)زەرەر وزیان لەماڵ وسامان. (تفسير السيوطي ج٥/٨٩٥)

(بِنُصْبٍ وعَذابٍ) سێ ڕووی هەیە:

یەکەم: (بِنُصْبٍ) ئازار(وعَذابٍ) نەخۆشی درێژخایەن ئەمە ووتەی(مبشر بن عبيد)ە.

دووەم: (بِنُصْبٍ) واتە: ئازاروئەشکەنجەلەجەستەیدا(وعَذابٍ)زەرەروزیان لەماڵ وسامانیدا ( السدي) بەم جۆرە دەڵێت.

سێیەم:(بِنُصْبٍ)سەختی وماندویەتی.(وعَذابٍ)بەڵاوموسیبەت.(النكت_والعيون_الماوردي-سورةص-ايه١٤)

(مَسَّنِيَ الشَّيْطَانُ بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ) وا توشی فرمان و کردارێکی قورس و گران ببوو هەستی بەئازارو ماندوبونێکی زۆردەکرد،شەیتان دەستی گرتبوو بەسەر هەموو جەستەیدا فوی پێدا کردبوو جەستەی هەمووی بووە بەزام رِۆژلە دوای رِۆژ زامەکە دەمی دەکردەوە وخراپتر دەبوون ئەم کارە تادەهات زۆرترو بەهێزتر وکاریگەرتر دەبوو لەسەرجەستەی ، هەروەها هەموو ماڵ منداڵ سامانەکەشی لەناو چوو. (تفسير السعدي) سورة ص-اية١٤)

شەیتان توانا ودەسەڵاتی تەواوی نیە بەتەواوەتی گومراکردن ولەرِێگای رِاست دەرکردنی باوەرِداران،بەڵام توشی زەرەرو زیان و ئازار و ئەشکەنجەیان دەکات، هەمووی ئەمانە بەگشتی لەژێر بەڵگەی ئەم ئایەتە کۆدەبێتەوە (مَسَّنِيَ الشَّيْطَانُ بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ) ئەیوب (عليه السلام) شەیتان تووشی کرد بەزەرەرو زیان و ئازار و ئەشکەنجە لەکاتێکدا پێغەمبەر بوو.

پێغەمبەری خودا(صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویت : (أشدُّ الناسِ بلاءً الأنبياءُ،ثم الأمثلُ فالأمثلُ) (صحيح الجامع ٩٩٣)

واتە پێغەمبەران سەخترین وبەهێزترین بەڵاومسیبەتەکانیان بەسەردادێت دوای ئەوان ئەوانەی وەك ئەوانن وئەوانەی وەکو ئەوانن (لەباوەرِداران و پیاوچاکان) (موسوعة الألباني في العقيدة - باب هل الشيطان ليس له سلطان علي المؤمن مطلقا ص١٢١)

(مَسَّنِيَ الشَّيْطَانُ بِنُصْبٍ وَعَذَابٍ) دەگێرِنەوە ئەیوب (عليه السلام) خودای گەورە رِێگەی بەشەیتان داوە زاڵبێت بەسەریدا تووشی فیتنەی بکات (وەکو بەڵاو تاقی کردنەوە) شەیتان

هەمووماڵەکەی لەناو برد ئارامی گرت ، دوای ئەوە هەموو منداڵەکانی لەناوبرد هەرئارامی گرت ، دوای ئەوە توشی نەخۆشیەکی سەر سەخت و بە ئازاری کرد هەر ئارامی گرت ، بۆیە ئەم ڕوداوە دەگێڕنەوە بۆ زاڵبونی شەیتان بەسەریدا لەماڵ ومنداڵ وجەستەیدا. (التسهيل لعلوم التنزيل –ابن جزي سورة ص- اية ١٤)

پ١٧/ شەیتان وجنۆکە دەچێتە ناوجەستەی مرۆڤ وخۆی تێ هەڵکێش دەکات ئەگەر چی باوەڕدارێکی چاکیش بێت .یاخود منداڵ یان مێرد منداڵێکیش بێت؟!

وڵام/ (يقولُ عُثمانُ بنُ أبي العاصِ رضِيَ اللهُ عنه:لَمَّا استعمَلني رسولُ اللَّهِ صلَّى اللَّهُ عليْهِ وسلَّمَ علي الطَّائفِ جعلَ يعرضُ لي شيءٌ في صلاتي حتَّي ما أدري ما أُصلِّي، فلمَّا رأيتُ ذلِكَ رحلتُ إلي رسولِ اللَّه (صلى الله عليه وسلم) فقال:ابنَ أبي العاصِ؟ قلت: نعَم يا رسولَ اللَّهِ. قال: ما جاءَ بِك؟ قلت: يا رسولَ اللَّهِ، عرضَ لي شيءٌ في صلواتي حتَّي ما أدري ما أصلِّي قال: ذاكَ الشَّيطانُ ادنُه فدنوتُ منْهُ، فجلستُ علي صدورِقدميَّ،قال: فضربَ صدري بيدِهِ،وتفلَ في فَمي وقال:اخرُجْ عدوَّ اللَّهِ ففعلَ ذلِكَ ثلاثَ مرَّاتٍ،ثمَّ قال:الحق بعَملِكَ.(سلسلةالأحاديث الصحيحة وشيءمن فقههاوفوائدها ١٠٠١/٦)

واتە: عوسمانی کوڕی ئەبولعاص دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)کاتێك کردمی بە لێپرسراو بەسەر(طائیف)ەوە،هەرکاتێك نوێژم بکردایە لێم تێك دەچوو نەمدەزانی چی دەکەم چۆن نوێژ بکەم ، ئیتر کە ئەمەم بەسەر هات گەڕامەوە بۆ مەدینە بۆ لای پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی(ابن أبي العاص؟) لە وەڵامدا گوتم بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا فەرمووی(ماجاء بك؟) ئەوە چی تۆی هێناوە؟ دەڵێ وتم ڕووداوەکەم بۆ گێڕایەوە لە وەڵامدا پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)فەرمووی ئەمە شەیتانە لێت نزیك بۆتەوە و لێ ی نزیك بویتەتەوە، دواتر دانیشت بەسەر پێشەوەی قاچەکانم دواتر بە دەستی موبارەکی دای لە سینگم و تفی

کردە ناو دەمم و گوتی(أخرج عدو الله) دەرچۆ ئەی دوژمنی خوا ، سیٚ جار کارەکەی دووبارە کردەوە و دواتر گوتی(الحق بعملك) بگەڕێرەوە بۆ سەر کارەکەت.

شێخ ئەلبانی- ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت لە باسی ئەم فەرمودەیەدا (اخرج عدو الله) (دەرچۆ ئەی دوژمنی خوا) دەفەرمویێت ئەو فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی شەیتان دەچێتە ناوجەستەی مرۆڤ وخۆی تێهەڵکێش دەکات ئەگەر چی باوەڕداری چاکیش بێت ئەم ڕووداوەش لە سەردەمی پێغەمبەردا(صلى الله عليه وسلم)ڕووی داوە.(سلسلة الأحاديث الصحيحةوشيءمن فقههاوفوائدها ج٦/ ١٠٢)

وەهەروەها لە فەرمودەیەکەی تردا هاتووە کە يعلى بن مره دەڵێت:(سافرت مع رسول الله ر(صلى الله عليه وسلم)فرأيت منه شيئا عجبا. وأتته امرأة فقالت: إنَّ ابني هذا به لَمٌ منذ سبع سنينَ يأخذه كلَّ يومٍ مرتَينِ فقال رسولُ اللهِ ر(صلى الله عليه وسلم):أَدْنيه فأدْنته منه فتفل في فِيه وقال اخرُجْ عدوَّ اللهِ أنا رسولُ اللهِ) (سلسلة الأحاديث الصحيحة وشيء من فقهها وفوائدها ج١/٨٧٥)

واتە: لە گەڵ پێغەمبەری خودا ر(صلى الله عليه وسلم) سەفەرم کرد شتێکی زۆر سەرسوڕهێنەرم بینی ئافرەتێك هاتە لای پێغەمبەر ر(صلى الله عليه وسلم)گوتی ئەم کورەی من حەوت ساڵ تووشی تیکچوون بووە هەموو ڕوژیٚ دووجاردەبورێنێتەوە، پێغەمبەری خودا ر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی نزیکی کەرەوە لەمن، ئەویش نزیکی کردەوە لیٚ ی پێغەمبەری خوداش تفی کردە دەمی و فەرمووی(اخرج عدو الله انارسول الله) (دەرچۆ ئەی دوژمنی خوا من پێغەمبەری خودام).

پ١٨/ ئایە شەیتان وجنۆکە دەچێتە لەشەوە یاخود لەجەستەدایە بەڵام زاڵ دەبێت بەسەریدا وجێگیردەبێت؟!

وڵام/ صەفییەی كچی حویەی هاوسەری پێغەمبەر دەفەرمویت پێغمبەری خودا(صلى الله عليه وسلم) فەرمویەتی :(فإِنَّ الشَّيْطَانَ يَجْرِي مِنَ ابْنِ آدَمَ مَجْرَي الدَّمِ) (صحيح البخاري٢٠٣٩)

واتە: شەیتان بەبۆڕیی خوێنی ئادەمیزاد دا هاتوچۆدەكات وەك خوێن چۆن هاتوچۆدەكات.

. ئیبنوحەجەری هەیسەمی لەڕاڤەی ئەم فەرمودەیەدا دەڵێت: بەم فەرموودەیە لە وەڵامی ئەو كەسە دەدرێتەوە كە ئینكاری ئەو قەزییە بكات(چونە لەشی جنۆكە) وەكو موعتەزیلەكان كە ئینكاری دەكەن،پاشان دەفەرمویت:جن دەچێتە نێو لەشی مرۆڤ، ئەوە مەزهەب و ڕێبازی ئەهلی سوننەتو جەماعەتە. (الفتاوي الحديثية-٧٢)

ئبن باز لەڕاڤەی فەرموودەكەدا دەڵێت: واجبە كار بەواتای ڕوكەشی فەرمودەكە بكرێت، لێكدانەوەی تری بۆنەكریّ،كە پێچەوانەی مانای ڕوكەشەكەیەتی،چونكە شەیتانەكان جۆرە نەژادو دروستكراوێكن، لەخودا زیاتر هیچ كەس زانیاری تاواوی نیە لەسەر چونیەتی ئەم دروست كراوە و زاڵبونیان بەسەر جەستەی مرۆڤدا. بۆیە پێویستە هەموو مسوڵمانێك پەنا بگرێتە خودا وپشت بەخودا ببەستیت لەشەرو خراپەیان، وبەردەوام بێت لەسەر ڕێگای ڕاست وبەكارهێنانی ئەڕیگایانەی خودای گەورە بۆ خوداپەرستی داێناوە وەكو زكرو یادكردنی خوداو وەپەناگرتن بە خوداو پشت بەستن پیّ ی، چونكە هەركەس بۆلای خودا بگرێتەوە وپەنا بە خودا بگرێت ئەوە خودا پەنای دەدات و دەیپارێزیت، چونكە هیچ پەرستراوێك نیە جگەلەخودا وهیچ هیزو تواناو دەستەڵاتێك نیە بە دەستی خودا نەبێت هەمووی ولەژێر فرمانی ئەودایە. (الردود البازية في بعض المسائل العقدية-٤٠٦)

ئەبوسەعیدی خودری (ڕەزاوڕەحمەتی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:( إِذَا تَثَاوَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيُمْسِكْ بِيَدِهِ عَلَي فِيهِ ، فَإِنّ الشّيْطَانَ يَدْخُلُ) (مسلم -٢٩٩٥)

واتە:كەسێكتان باوێشكی هات و دەمی كرایەوە با بەدەستی بان دەمی بگرێت چونكە شەیتان دەچێتە ژوورەوە.

هەرچەندە شەیتان بەبۆریی خوێنی ئادەمیزاد دا هاتوچۆدەكات وەك خوێن چۆن هاتوچۆدەكات بەڵام ناتوانێت زاڵ بێت بەسەریدا وجێگربێت لەلەشیدا،تاوەكو زیكرویادی خودا دەكات بەڵام ئەوكەسەی لەوكاتەدا باوێشك دەدات زیكرویادی خودا ناكات شەیتان زاڵ دەبێت بەسەریداو دەچێتە جەستەیەوە.

دەكرێت چونەژورەوە بۆلەشی مرۆڤ بەبەردەوامی بێت بۆی بەڵام لەوكاتەدا خۆی جێگیر دەكات وزاڵ دەبێت بەسەریدا،چونكە ئەگەر كەسێك چووە نێو شتێكەوە دەبێت جێگرو زاڵ بێت بەسەر ئەو شتەدا و بەئارزوی خۆی كاری پێ بكات. (فتح الباري شرح صحيح البخاري ج١٢/١٠٧) .

پ١٩/كاریگەری خراپەكانی شەیتان وجنۆكە بۆسەرمرۆڤ هەندێ جاردەبێتە هۆی تێكدانی سروشتی مرۆڤەكە یاخود كوشتن و لەناوبردنی ؟

ولّام/ عن أبي موسى (رضي الله عنه)قال: قال رسول الله (صلى الله عليه وسلم) (فَنَاءُ أُمَّتي بالطَّعْن والطَّاعون)). فقيل: يا رسول الله، هذا الطَّعْنُ قد عَرَفْناه، فما الطَّاعون؟ قال: ((وَخْزُ أعدائِكم مِن الجِنِّ وَفِي كُلّ شُهَدَاءُ ). (صحيح الجامع ٤٢٣١)

ئەبو موسا دەیگێڕێتەوە دەڵێت پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) فەرموی: لەناوچونی ئومەتەكەم بە(الطَّعْن) كوشتن و(الطَّاعون)پەتا دەبێت.گوتیان واتای(الطَّعْن) كوشتن دەزانین.بەڵام ((الطَّاعون))چیە؟ فەرمووی (وَخْزُ أعدائِكم مِن الجِنِّ) واتە: لێدان لەلایەن دوژمنەكانتانەوە دەبێت لەجنۆكە(وَفِي كُلّ شُهَدَاءُ) وكوشتن بەهۆی هەركەمیانیشەوە بەشەهید دەژمێرێت.

پێغەمبەری خودا(صلى الله عليه وسلم)دەیگێڕێتەوە هۆکاری مردن ولەناوچونی زۆربەی ئەم ئومەتە دووهۆکارە یەکەم کوشتن بە چەك بەهۆی جەنگ لەگەڵ بێباوەڕان یاخود لەنیوان مسوڵمانان خۆیاندا بەهۆی فتنەو ئاشوبەوە دەبێت دووەم تاعون کە پەتایەکی فروانە وخەڵکێکی زۆر لەناودەبات کەهۆکارەکەی لێدانی جنۆکەیە،وەهەندێ دەڵێن مەبەستی پێغەمبەر دوعا بووە نەوەکو هەواڵدان،ویستویەتی ئومەتەکەی بگاتە بەرزترین جۆرەکانی شەهیدی لەپێناو خودادا بەهۆی دوژمنەکانیانەوە ئەو دوژمنە دوژمنی مرۆڤ بێت یان دوژمنی جن و پەری.(شروح الأحاديث / الموسوعة الحديثية)

کاتێك پرسیار کرالەبارەی خوێن هەبوونی بەردەوام لەهەندێ لەئافرەتاندا(استحاضة) پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (إنَّما هذه رَكْضةٌ مِن رَكَضاتِ الشَّيطانِ) أي: ضربةٌ مِن ضَرَباتِ الشَّيطانِ) (صحيح أبي داود ٢٨٧)

واتە:(بێگومان خوێن هەبوونی بەردەوام لە ئافرەتدا(استحاضة) لێدانێکە لە لێدانەکانی شەیتان.(الركض)واتەلێدان،چۆن بدەی لە کەسێك زەرەرو زیانی پێ بگەیەنیت بۆمەبەستی خراپەکاری، شەیتانیش ئەم ڕێگایەی بەکارهێناوە بۆ هەڵخەڵەتاندنی ئافرەتان بۆ ئەوەی سەریان لێتێك بدات نەزانن کەی پاك بووەنەتەوە ڕۆژە زانراوەکانی خۆیان لێ تێك دەدات تانەتوانن نوێژو دینداری بەرێك وپێکی بکەن (شروح الأحاديث / الموسوعة الحديثية)

(استحاضة)کردارێکە زۆر بەکەمی لەئافرەتاندا ڕوو دەدات کەبە بەردەوامی خوێنی هەبێت،ئەگینا بنەڕەت لەئافەرەتدا سوڕی مانگانەیە کەمانگی یەکجار توشیان دەبیت کەچەند ڕۆژێکی دیاری کراوە نیشانەکانیش لای ئافرەتان ناسراوە، بەڵام(استحاضة) لێدانێکە وە لەلایەن شەیتانەوە دەبێتە هۆی نەزیفی وخوێن بەربونی بەردەوام چۆن دەست ببڕێت خوێنی هەیە ڕەنگی وەکو خوێنی سروشتی وایە و بۆنی نییە، ئەم خوێنە جیاوازە لەخوێنی سوڕی

مانگانە کەرِەش و بۆنی هەیە. (كتاب شرح بلوغ المرام لعطية سالم /كتاب الطهارة - باب الحيض / الاستحاضة)

لەفەرمودەیەکی تردا پێغمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویێت: قال رَسولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) تَعوَّذوا باللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيمِ، مِن هَمزِه، ونَفخِه، ونَفثِه. قالوا: يا رَسولَ اللهِ، وما هَمزُه، ونَفخُه، ونَفثُه؟ قال: أمَّا هَمزُه، فهذه المُوتةُ التي تأخُذُ بَني آدَمَ، وأمَّا نَفخُه، فالكِبرُ، وأمَّا نَفثُه، فالشِّعرُ .(حسنه شعيب الأرناؤوط في تخريج المسند٢٥/٢٢٧)

پێغمبەر(صلى الله عليه وسلم) (پەنا بگرن بە خودا لەشەیتانی دورخراوە لە بەزەیی خودا وئەوانەی بەهۆیەوە ڕوودەدەن لە(شێتی وتێکچونی دەرونی(مردن) ،خوبەگەورەزانین،شیعروهۆنراوە(مەبەست شیعروهۆنراوەی خراپ وهیچ وپوچە)گوتیان پێغەمبەری خودا(وما هَمزُه، ونَفخُه، ونَفثُه؟) پێغمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (هَمزُه) ئەومردنەیەکەتوشی مرۆڤ دێت بەهۆی ئەوانەوە (ونَفخُه) خۆبەگەورە زانین (ونَفثُه) شیعروهۆنراوە(مەبەست شیعروهۆنراوەی خراپ وهیچ وپوچە)

پ٢٠/ تێکچوون و لە هۆش چوون دوو جۆرە یەکێکیان بەهۆی نەخۆشی وبوونی کێشەیەك لەمێشکدایە دووەم بەهۆی دەست وەشاندن تێکدانەوە دەبێت لەلایەن جنۆکەو شەیتانەوە؟

وڵام/ شێخ ئبن عثيمين دەڵێت : لەهۆش چوون وتێکچوون دووجۆرە: یەکەم لەهۆش چوون بەهۆی دروست بوونی کێشەیەك لەمێشکی مرۆڤدا، کەئەمە جۆریکە لەنەخۆشی کەچۆن لەئەندامێك لەئاندامەکانی تری جەستەدا دروست دەبێت، دەکرێت لە لایەن دکتۆرەکانەوە چارەسەر بکرێت،بە پێ دانی دەواو دەرمان، ئارامی بکەنەوە یاخود بەتاواوەتی چارەسەری بکەن بەبەکارهێنانی ڕێکارە پزیشکیەکان،جۆری دووەم لەهۆش چوون تێکچوون، بەهۆی جنۆکەو شەیتانەکانەوە ڕوودەدات، کە جنۆکە زاڵدەبێت بەسەر جەستەی مرۆڤەکەدا توشی تێکدان و لە هۆش چوونی دەکات، بەهۆی بەهێزی دەست لێ وەشاندنەکەیەوە کەسەکە

خەبەری لە خۆی نامێنێت، وەهەست بەهیچ ناكات بەجۆرێك دێتە سەر زمانی و قسە دەكات خۆی دەكاتە كەسەكە و ئەوی گوێ ی لێبێت دەڵێت مرۆڤەكە خۆیەتی بەڵام خۆی نییەو جنۆكەكەیەو خۆی گۆڕیوە وهاتوەتە سەرزمانی، هەست بەگۆڕانكاری لە شێوەی گوفتاریدا دەكەیت كەوەك ئەو كاتەی كەئاگای لە خۆی بووە قسەناكات جیاوازی لە ووتەكانیداهەیە، پەنا دەگرینە خودا لەم جۆرە تێكچوونە،چارەسەریش بەخوێندنەوەی قورئان دەبێت بەسەریدا كە خاوەن زانست و كەسانی چاكەكار و بە توانا لەو بوارەدا هەڵدەسن بە خویندن بەسەر كەسی توش بودا .(شرح رياض الصالحين/باب الصبر/٤٣)، منهج الشرع في علاج المس والصرع ٤٧-٤٨) .

عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَباحٍ، قَالَ: قَالَ لِي ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَلَا أُرِيكَ امْرَأَةً مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ؟ فَقُلْتُ: بَلَي، قَالَ: هَذِهِ الْمَرْأَةُ السَّوداءُ أَتَتِ (صلى الله عليه وسلم) ، فَقَالَتْ: إِني أُصْرَعُ، وَإِنِّي أَتَكَشَّفُ، فَادْعُ اللهَ تَعَالَي لِي، قَالَ: «إِنْ شِئْتِ صَبَرتِ وَلَكِ الْجَنَّةُ، وَإِنْ شِئْتِ دَعَوتُ اللهَ تَعالَي أَنْ يُعَافِيَكِ»، فَقَالَتْ: أَصْبِرُ، فَقَالَتْ: إِنِّي أَتَكَشَّفُ فَادْعُ اللهَ أَنْ لَا أَتَكَشَّفُ، فَدَعَا لَهَا) (صحيح البخاري٥٦٥٢)

واتە: (عطاء بن أبي رباح) فەرمووی : عبداللە ی كوڕی عباس (ڕەزای خوای لێبێت) پێی فەرمووم : ئایا ئافرەتێكت پیشان بدەم كە لەبەهەشتدایە یاخود دەچێتە بەهەشتەوە ؟ منیش پێم گوت بەڵێ ، ئەویش فەرمووی : ئەو ئافرەتەیە ، دەگێڕنەوە ئافرەتەكە ناوی (دایكی زوفەر) بووە ، وە فەرمووی : ئەو ئافرەتە هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و پێی فەرموو : من لەهۆش خۆم دەچم (بەهۆی دەست لێ وەشاندنی جنۆكەوە)و لەو كاتەشدا لاشەم دەردەكەوێت و جل و بەرگەكەم لەسەر لاشەم لادەچێت ، بۆیە لای پەروەردگار دوعام بۆبكە .پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) پێی فەرموو : ئەگەر دەتەوێت و دەتوانیت ئارام بگریت ئەوا بەهەشتت بۆ هەیە ، وە ئەگەریش ویستت هەیە ئەوا دوعات بۆدەكەم لای پەروەردگار تاوەكو

چاك بيتەوە ؟ ئەو ئافرەتە ئيمانداره سەرەڕای ئەوەش فەرمووی : بەڵێ من ئارام دەگرم (واتە بەهەشتم دەوێت) ، بۆيە داوای لەپێغەمبەری خوا كرد (صلى الله عليه وسلم) تاوەكو دوعای بۆبكات تەنها لاشەی بەدەر نەكەوێت ، پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) دوعای بۆكرد ئيتر لەپاش ئەوە لاشەی بەدەر نەدەكەوت .

الحافظ ابن حجر له فتح الباري شرح صحيح بخاريدا دەڵێت : لای بزار لەڕێگەيەكی ترەوە له(ابن عباس)ەوە دەی گێڕێتەوە وەكو ئەم ڕوداوە بەڵام لەو ڕيوايەتەدا دەڵێت (إنِّي أخافُ الخبيثَ أنْ يُجرِّدَني فدَعَا لها " فكانتْ إذا خَشِيَتْ أنْ يأتِيَها تأتِي أستارَ الكعبةِ فتَعلَّقُ بِها ، فتقولُ لهُ : اخْسأْ فيذهبُ عنْها) (مختصر البزار ٣٧/١- أصله بغير هذا السياق في البخاري)

واتە ئەترسم لەم ناپاكە مەبەستی شەيتان بووە جل بەرگەكەم لێ بكاتەوە جەستەم دەركەوێت، واتە لەكاتی تيكچووندا خەبەرم نەمێنێت جەستەم دەركەوێت،ئيتر پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) دوعای بۆ كرد وەهەركاتێك بترسايە لە هۆش چوونی بۆبهاتايە خۆی هەڵدەواسی پەردەی كەعبەداو دەی فەرموو بێدەنگ ئەی بێ نرخ (إخسأ) بۆ سەگ بەكاردێ كاتێ دەری دەكەيت و پێی دەڵێيت چغە) ئيتر لێ دووردەكەوتەوە.

ئەم فەرموديە لەم ڕێگايەوە بۆمان ڕون دەكات ئەم لەهۆش چوونە دايكی زوفەر بەهۆی جنۆكە و شەيتانەوە بووە نەوەكو لەهۆش چوون بەهۆی نەخۆشيەوە كەلە جەستەيدا هەبێت، لەڕێگەيەيەكی ترەوە ئەم فەرموودە هاتووە كەپشتگيری ئەوە دەكات كە ئەم لەهۆش چوونە بە هۆی جنۆكە و شەيتانەوە بووە( جاءت امرأةٌ إلي النَّبيِّ (صلى الله عليه وسلم) وبها طَيفٌ ، فقالت : يا رسولَ اللهِ ، ادْعُ اللهَ أن يشفيَني . فقال : إن شئتِ دعوتُ اللهَ فشفاك ، وإن شئتِ فاصبري ولا حسابَ عليك . فقالت : بل أصبِرُ ، ولا حسابَ عليَّ ) (أخرجه أحمد-٩٦٨٧)، (والبزار -٧٩٨٠)

ابن منظور دەڵێت:(والطيف) واتا دەست وەشاندنی شەیتان لەمرۆڤ و تێكدانی،بەدوایدا ئەم ئایەتەی خوێندەوە (إِذَا مَسَّهُمْ طَائِفٌ مِنَ الشَّيْطَانِ) (الأعراف-٢٠١) بە خوێندنەوەی هەندێ لەمەكیەكان وبەصریەكان و كوفیەكان (إِذَا مَسَّهُمْ طَيْفٌ مِنَ الشَّيْطَانِ) واتە كاتێك زیان وخەتەر لە(وەس وەسەو دەستلێوەشاندن)یان پێ بگات لەشەیتانەوە. (لسان العرب٩/٢٢٥)

عن أم أبان بنت الوازع بن زارع بن عامر العبدي ، عن أبيها ( أن جدها الزارع انطلق إلي رسول الله (صلى الله عليه وسلم) : فانطلق معه بابن له مجنون ، أو ابن أخت له — قال جدي : فلما قدمنا علي رسول الله ، قلت : إن معي ابنا لي أو ابن أخت لي - مجنون ، أتيتك به تدعو الله له ، قال :(ائتني به ) ، قال : فانطلقت به إليه وهو في الركاب ، فأطلقت عنه ، وألقيت عنه ثياب السفر ، وألبسته ثوبين حسنين ، وأخذت بيده حتي انتهيت به إلي النبي (صلى الله عليه وسلم) فقال : ( ادنه مني ، اجعل ظهره مما يليني ) قال بمجامع ثوبه من أعلاه وأسفله ، فجعل يضرب ظهره حتي رأيت بياض إبطيه ، ويقول : أخرج عدو الله ، أخرج عدو الله ) ، فأقبل ينظر نظر الصحيح ليس بنظره الأول . ثم أقعده رسول الله (صلى الله عليه وسلم) بين يديه ، فدعا له بماء فمسح وجهه ودعا له ، فلم يكن في الوفد أحد بعد دعوة رسول الله يفضل عليه ) .(مجمع الزوائد ٩/٥.فيه (أم أبان) لم يرو عنها غير مطر. أم أبان بنت الوازع بن الزارع: مقبولة ،من الطبقة الرابعة ، أخرج لها البخاري وأبو داوود - أنظر تقريب التهذيب - ٩١٩ / ٢ ، و ميزان الاعتدال — ٩١١)

واتە : دایكی ئابان كچی الوازع كوڕی زارع لەباوكیەوە دەی گێڕێتەوە كەبابای دەرچوو بۆ لای پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ كوڕێكی خۆی یان كوڕی خوشكەكەی بوو كە باری دەروونی تێك چووبوو(شێت)ببوو. باپیرم گوتی كاتی گەیشتینە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گوتم پیغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) كوڕێك یان كوڕ خوشكێكم لەگەڵە باری دەرونی تێكچووەو شێت بووە بپاڕێوە و لە خودای گەورە شیفای بدات فەرمووی بیهێنە بۆم ڕۆیشتم بیهێنم لەلای

قافلەی وشترەکان بوو جل وبەرگی سەفەرەکەم لەبەری داکەندو پاکم کردەوەو دوبەرگی بان خواری باشم کردە بەری و بردم بۆلای پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی نزیکی کەرەوە لیم پشتی کرد لەمن فەرمووی جل وبەرگەکەی بەرزکەرەوە تا سپیای ژیر بالیم بینی دەی کێشا بە پشتیدا دەی فەرموو:(دەرچۆ ئەی دوژمنی خودا دەرچۆ ئەی دوژمنی خودا)دوای ئەوە بەشێوەیەکی ئاسایی تێمانی دەڕوانی نەوەکو کاتی تێکچونەکەی دوای دانیشاند لەبەردەمی خۆیدا فەرمووی ئاوم بۆبێنن وە دەموچاوی پیێ ی سڕی و دوعای بۆ کرد .دوای دوعاکەی پێغەمبەر هیچ کەسێ ناو قەومەکەمان لە ئەو باشتر نەبوو بەهۆی فەزڵ وگەورەیی دوعاکەی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)

مامۆستا عبدالكريم نوفان عبيدات دەلێت:( ئەم فەرمودە بەڵگەیە کەجن دە چێتە لەشی مرۆڤەوەو شێتی دەکات).

خاوەنی کتێبی طارد الجان ( ئیمە لەووتەی (اخرُجْ عدوَّ اللهِ) واتە: دەرچۆ دوژمنی خودا بەڵگەی تەواو دەبینین کەرێگری دەکات لەئەوکەسانەی ئەو ڕەت دەکەنەوە کەجن بچێتە لەشەوە ئەگەر بیربکەینەوە لەووشەی (اخرُجْ ) واتە دەرچۆکەواتە چوونە ژورەوەیەك ڕویداوە بۆیە ئەگینا پیغەمبەری خودا نەیدەفەرموو دەرچۆ. (منهج الشرع في علاج المس والصرع ٤٧-٤٨)

پ٢١/زانایان ئەهلی سونەو جەماعەت یەك دەنگن کە جن دەچێتە لەشی مرۆڤەوەو تێکی دەدات؟

وڵام/ عەبدوڵلای کوڕی ئیمام ئەحمدی کوڕی حەنبەل-ڕەحمەتی خوای لیێ بێت- دەلێت بە باوکم وت باوکە خەڵکانێك دەڵێن جنۆکە ناچێتە ناو لەشی ئەو کەسەی تووش هاتوە ،لە وەڵامدا

باوکم پێی وتم:( **یابنی،یکذبون هو ذا یتکلم علي لسانه)** واتە: کورەکەم درۆ دەکەن جنۆکەکە لەسەر زاری ئەودا ئەو قسەیە دەکات. (مجموع الفتاوي ٢٤ /٢٧٦ )

شیخ الإسلام ئیبن تیمیه ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت دەفەرمووێت: (وجود الجن ثابت بكتاب الله وسنة رسول الله واتفاق سلف الأمة،وكذلك دخول الجني في بدن الإنسان ثابت باتفاق اهل السنةوالجماعة.(الفتاوي٢٤/٢٧٧)

واتە: هەبوونی جنۆکە شتێکی جێگیرە بە بەڵگەی قورئان و سونەتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) وزانایانی پێشینی ئۆمەتی ئیسلام،وە چوونی جنۆکە بۆ ناو لەشی مرۆڤ شتێکی.جێگیرە بە یەکدەنگی شوێنکەوتوانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت.

شێخ ئیبن عثیمین ڕەحمەتی خوای لەسەر بێت- دەفەرموێت (وبهذا تبين أن صرع الجن للإنس ثابت بمقتضي دلالة الكتاب والسنة والواقع، وأنكر ذلك المعتزلة.(مجموع فتاوي ورسائل ج١/٢٩٩ )
واتە: بەو شێوەیە ڕوون بۆتەوە بورانەوە و لێدانی جنۆکە بۆ مرۆڤ و شتێکی جێگیرە بە بەڵگەی قورئان و سوننەت و واقیعی خەڵکیشدا (کەخەڵکانێك دەبینیت توش هاتوون)، بەڵام موعتەزیلەکان ئینکاری ئەوە دەکەن.

پ٢٢/ سیحر چیە؟ ئایە کاریگەری دەبێت؟

وڵام/ ووشەی سیحر لەزمانی عەرەبیدا بەکاردێت بۆ هەموو ئەو شتانەی کەهۆکارەکانی شاراوەن ودیارنین. دەبیتە هۆی هەڵخەڵەتاندن. (المعجم الوسيط ٤٣٦)

ئیبن قدامە دەڵێت: سیحر بریتیە لەگرێ و نوشتە(جا بە ووتە بێت یا بەنوسین)بێت یاخود کارێك کە کاریگەری دەکات لەسەر (دڵی یاخود ئەقڵی)کەسی بەرامبەر بەبێ ئەوەی

ڕوبەڕوشی بێتەوە. ئەمەش بونی هەیە و ڕاستە هەندێکی دەبێتە هۆی نەخۆش خستن وهەندێکی تری دەبیتە هۆی کوشتن و لەناو بردن و هەندێکی تری بەینی پیاو ئافرەت دەکات ولەیەکیان جیا دەکاتەوە، یاخود رقوکینە دەخاتە نێوانیانەوە ژنەکەی لەپێش چاوی پیاوەکەی ناشرین دەکات یا پیاوەکە لەپێش چاوی ژنەکە ناشرین دەکەن وا دەکات خۆشەویستیان ببێتە(بوغزو) ڕق لێبوونەوە لەیەکتری. (المغني شرح مختصر الخرقي ج١٢/٢٩٩)

کاریگەری جادوکردنی جولەکە لە پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) لەسەرجەستە و بیرکردنەوەی نەك لەسەر پەیام وپێغەمبەرایەتیەکەی چونکە هەموو پێغەمبەران توشی جۆرها بەڵاو ناخۆشی دەبنەوە وە هەروەها بۆئەوەی جێگیر بێت کە سیحر بوونی هەیەو پیویستە هەموو مسوڵمانێك بڕوای پی بهێنێت.

عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: سَحَرَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَهُودِيٌّ مِنْ يَهُودِ بَنِي زُرَيْقٍ، يُقَالُ لَهُ لَبِيدُ بْنُ الْأَعْصَمِ، قَالَتْ: حَتَّي كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ يَفْعَلُ الشَّيْءَ وَمَا يَفْعَلُهُ، حَتَّي إِذَا كَانَ ذَاتَ يَوْمٍ -أَوْ ذَاتَ لَيْلَةٍ- دَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) ثُمَّ دَعَا ثُمَّ دَعَا، ثُمَّ قَالَ: (يَا عَائِشَةُ، أَشَعَرْتِ أَنَّ اللَّهَ أَفْتَانِي فِيمَا اسْتَفْتَيْتُهُ فِيهِ؟ جَاءَنِي رَجُلَانِ، فَقَعَدَ أَحَدُهُمَا عِنْدَ رَأْسِي وَالْآخَرُ عِنْدَ رِجْلَيَّ، فَقَالَ الَّذِي عِنْدَ رَأْسِي لِلَّذِي عِنْدَ رِجْلَيَّ، أَوِ الَّذِي عِنْدَ رِجْلَيَّ لِلَّذِي عِنْدَ رَأْسِي: مَا وَجَعُ الرَّجُلِ؟ قَالَ: مَطْبُوبٌ، قَالَ: مَنْ طَبَّهُ؟ قَالَ: لَبِيدُ بْنُ الْأَعْصَمِ، قَالَ: فِي أَيِّ شَيْءٍ؟ قَالَ فِي مُشْطٍ وَمُشَاطَةٍ قَالَ وَجُفِّ طَلْعَةِ ذَكَرٍ، قَالَ: فَأَيْنَ هُوَ؟ قَالَ: فِي بِئْرِ ذِي أَرْوَانَ). قَالَتْ: فَأَتَاهَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِي أُنَاسٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، ثُمَّ قَالَ: (يَا عَائِشَةُ، وَاللَّهِ لَكَأَنَّ مَاءَهَا نُقَاعَةُ الْحِنَّاءِ، وَلَكَأَنَّ نَخْلَهَا رُءوسُ الشَّيَاطِينِ). قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلَا أَحْرَقْتَهُ؟ قَالَ: (لَا، أَمَّا أَنَا فَقَدْ عَافَانِي اللَّهُ، وَكَرِهْتُ أَنْ أُثِيرَ عَلَي النَّاسِ شَرًّا، فَأَمَرْتُ بِهَا فَدُفِنَتْ) (بخاري / الطب/٥٤٣٠ )(مسلم - ١٣٧٥)

عائشه(خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: جولەکەیەك لە جولەکەکانی (بنی زریق)کە پێی دەوترا (لبید بن الاعصم) جادووی کرد لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەتا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وادەهات بە خەیاڵیدا کەشتێکی کردووە نەیشی کردبوو، هەتا ڕۆژێك یان شەوێك- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پاڕایەوە، هەر پاڕایەوە هەرپاڕایەوە، پاش ئەوە فەرمووی: (ئەی عائشە ئایا هەستت کرد خوا ئاگاداری کردم لەوشتەی داوام لێکرد ئاگادارم کات؟ دوو پیاو هاتن بۆ لام یەکێکیان لای سەرم و ئەوی تریان لای قاچم دانیشت، ئەمەی لای سەرم بەوەی لای قاچم یان ئەوەی لای قاچم بەوەی لای سەرمی وت : ئازاری ئەم پیاوە چییە؟ وتی: جادووی لێکراوە، وتی: کێ جادووی لێکردووە؟ وتی: (لبید)ی کوڕی (أعصم) وتی: لە چ شتێکدا؟ وتی: لەشانەیەك و چەند تاڵێك موو کەبەدەم شانەکردنی سەر یان ڕیشەوە دەکەونە خوارەوە لەناو قاوغی گوڵی دارخورمایەکی نێردا، وتی: وا لەکوێدا؟ وتی: وا لەناو بیری (ذي أروان)دا. عائشە دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ چەند کەسێك لەهاوەڵانیدا چوو بۆ لای ئەو بیرە، لەپاشدا فەرمووی: (ئەی عائشە واللە ئاوی ئەو بیرە وەك خەنەی تێکرابێ وەهابوو، دارخورماکانیشی وەك سەری شەیتانەکان بوون) عائشە دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا ئایا نەتسوتاند؟! فەرمووی: (نەخێر، چونکە من خوا شیفای دام، پێیشم ناخۆش بوو شەڕ بئاڵۆزێنم بۆ خەڵکی، فەرمانم دا لەبیرەکە دەریان هێنا و خستیانە ژێر گڵەوە).

پ٢٣/سیحر وجادوو ڕاستە بوونی هەیە نە خەونە و نەخەیاڵ ؟

وڵام/ خودای گەورە دەفەرموت: (وَمِنْ شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي الْعُقَدِ) (الفلق -٤) واتە:لە شەڕ و خراپەی ئەو کەسانەی کە جادوو دەکەن و پەت و دەزوو گرێ دەدەن و فووی پیادەکەن (بەفێڵ و جادوو نێوانی خەڵکی تێك دەدەن).ئەگەر بوونی نەبوایە خودای گەورە فرمانی نەدەکرد بەوەی پەنا بگرنە خودای خۆی لە شەر وخراپەی شەیتان .

ئەمە بەڵگەیە لەسەر پووچی ووتەی گروپی موعتزیلەکان کە بوونی سحرو جادوو کاریگەریەکانی ڕەت دەکەنەوە (مدارك التنزيل - النسفى(الفلق — ٤)

لەم فەرمودەیەدا پێغمبەر(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (مَن عقَد عُقدةً ثمَّ نفَث فيها فقد سحَر ومَن سحَر فقد أشرَك ومَن تعلَّق شيئًا وُكِل إليه) (شرح كتاب التوحيد لابن باز.منقطع لكن له شواهد من حيث المعني-١٨٨ )

واتا:هەرکەسێك پەتێك گرێ بدات و پاشان فووی پێدا بکات، ئەوە بێگومان جادووی کردووە، وە هەرکەسێکیش جادوو بکات ئەوە هاوەڵی بۆ خودا داناوە،وە هەرکەسێك دڵی پابەند بێت بەشتێکەوە ئەوە هەواڵەی لای ئەو شتە دەکرێت،هەرچەندە شیخ ئەلبانی دەڵێت ئەم فەرمودە لاوازە بەڵام شێخ بنباز دەڵێت ئەم ئایەتە (وَمِنْ شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي الْعُقَدِ) (الفلق -٤). پشتگیری دەکات.

هەروەها لەئایەتێکی تردا خودای گەورە دەفەرموێت: (فَلَمَّا جَاءَ السَّحَرَةُ قَالَ لَهُمْ مُوسَىٰ أَلْقُوا مَا أَنْتُمْ مُلْقُونَ) (يونس-٨٠) واتە:جا کە جادووگەرەکان(ساحرەکان) هاتن موسا پێیگوتن: ئەوەی کە دەیهاوێژن ،دەسا بی هاوێژن.

لەئایەتێکی تردا خودای گەورە دەفەرموێت: (وَجَاءُوا بِسِحْرٍ عَظِيمٍ) (الأعراف-١١٦)

واتە:سیحرو جادوویەکی گەورەیان نواند.

لەئایەتێکی تردا خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَفَتَأْتُونَ ٱلسِّحْرَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ﴾(سورة الأنبياء- ٣)

واتە : ئایا ئێوە دێنەلای جادوو و دەسخەڕۆی جادوودەبن و، لەحاڵێکا چاوتان هەیەو دەبینن، واتە: ئەگەر پەیڕەوی لێ بکەن، وەك ئەوەیە پەیڕەویتان لەسیحر کردبێت.

لەئایەتێكی تردا خودای گەورە دەفەرموێت:﴿وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ﴾ (سورة طه- ٦٩)

واتە :جادووگەریش بۆ هەر كوێ بچێت و هەرچی بكات سەركەتوو نابێت.

لەئایەتێكی تردا خودای گەورە دەفەرموێت :(وَاتَّبَعُوا مَا تَتْلُو الشَّيَاطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَانَ ۖ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ وَلَٰكِنَّ الشَّيَاطِينَ كَفَرُوا يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ ۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَا إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الْمَرْءِ وَزَوْجِهِ ۚ وَمَا هُم بِضَارِّينَ بِهِ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ۚ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ.... (البقرة-١٠٢) واتە: هەندێ جولەكە كەوتنە شوێنی ئەوجادووە كە شەیاتینی سەردەمی پاشایەتی ودەسەڵاتی سولەیماندا (علیه السلام) دایان هێناو دەیانخوێند، واتە: كەوتنە شوێنی ئەوفرِوفێڵانەی دەربارەی حكومەتەكەی سولەیمان دەیانكرد ،خۆ ئاشكراشە كەسولەیمان كافرو جادووگەر نەبوو و ئەویش 'جادووی دانەهێنا' وەك ئەوان دەڵێن ، بەڵكو شایاتینەكان جادوویان داهێناو كافرو بێ بڕوا بوون و لەسنوور دەرچوون و خەڵكیشیان فێری جادوو دەكرد، هەروەها كەوتنە شوێنی ئەو زانیاریی و زانستەی هاتبوویە سەر ئەو دوو فریشتەیە (هاروت وماروت) لە (بابل)ی عیڕاقدا، لەوسەردەمەدا خەڵكی زۆر سەرقاڵبوون بە جادوو و فڕوفێڵ لەگەڵ یەكتردا، جا لەوكاتەدا خوای گەورە ئەودوو فریشتەی نارد تا جادوویان بۆ ڕوون بكەنەوەو خەڵكی تێبگاو بەهەڵە نەچن و بزانن كە جادوو لەگەڵ موعجیزەی پەیامبەرێتیدا دووشتی لێكجیاوازن، وە لەهەمان كاتیشدا ئەو دوو فریشتەیە بەخەڵكەكەیان دەوت: ئێمە تەنها مایەی تاقیكردنەوەین وهاتووین بۆ بەتاڵكردنەوەو هەڵوەشانەوەی سیحر،ئاگەداربن ئێوە نەفێری ببن و نە ڕەفتاریشی پێ بكەن، بەڵێ.. كاری ئەو دو فریشتەیە هەر ئەمە بوو، وە لەهەمان كاتدا هەر كەسێكیان فێری جادوو دەكرد لە سەرەتاوە پێیان دەگوت: ئەم كارەی ئێمە تەنها بۆ تاقیكردنەوەو فێربوونی جیاكردنەوەی (موعجیزە) و(سیحرە) و لەلایەن خواوە نێردراوین، كەوابوو ئاگادار بە خۆت

كافر مەكە و فێری جادوو نەبیت ،بەڵام هەندێك هەر كۆڵیان نەدا تالەو دوو فریشتەوە فێری ئەمە بوون كەبتوانن بەسیحر ژن ومێرد لێكبكەنەوە واتە: خەڵكەكە بەگوێی فریشتەكانیان نەكردو، فێری جادوو بوون وپاشان جادووو سیحریان لەیەك دەكردو جۆرەها كاری ناپەسەندو ناشەرعییان ئەنجام دەدا، هەرچەند بەبڕیاری خوا نەبوایە ئەو جادووگەرانە توانایان نەبوو زیانێك بەهیچ كەسێ بگەیەنن .

سیحرو جادوو یەكێكە لەحەوت تاوانە گەورەكە بەبەڵگەی ئەم فەرموودەیە: (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلي الله عليه وسلم) قَالَ: (اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ). قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا هُنَّ؟ قَالَ: (الشِّرْكُ بِاللَّهِ، وَالسِّحْرُ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ، وَأَكْلُ الرِّبَا، وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ، وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ، وَقَذْفُ الْمُحْصِنَاتِ الْغَافِلَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ)
(البخاري- ٢٦١٥) (مسلم -٤٧)

واتە:(ئەبوهریرە)(خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (دووربكەونەوە لەوحەوت گوناهەی كە ئادەمیزاد تیادەبەن) وتیان: ئەوانە چین ئەی پێغەمبەری خوا فەرمووی: (هاوەڵ بۆ خوا بریاردان، سیحر(جادوو)، كوشتنی ئادەمیزاد كە خوا حەرامی كردووە، مەگەر بەهەقی خۆی، سوو خواردن، خواردنی ماڵی هەتیوو، پشت هەڵكردن لە ڕۆژی جەنگی كافراندا، بوختان كردن بۆ ئافرەتانی باوەڕداری بێئاگای پاكداوێن).

وەهەروەها پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (لَيْسَ مِنَّا مَنْ تَطَيَّرَ أَوْ تُطُيِّرَ لَهُ ، أَوْ تَكَهَّنَ أَوْ تُكُهِّنَ لَهُ ، أَوْ سَحَرَ أَوْ سُحِرَ لَهُ) (سلسلة الصحيحة- ٢١٩٥)

واتە: لە ئێمە نی یە ئەوكەسەی باڵندە هەڵبدات یان بۆی هەڵدەن وەلە ئێمە نییە ئەوكەسەی فاڵ بگرێتەوە یان بۆی بگرنەوە،یان جادوو سیحربكات یان جادوو سیحری بۆبكرێ.

پ٢٤/ ئایا کۆی زانایانی لەسەر ئەوڕایەن کە سیحرو جادوو ڕاستەو بوونی هەیە؟

وڵام/ ئیمامی نەوەوی دەڵێت : (والصحيح أن السحر له حقيقة وبه قطع الجمهور وعليه عامة العلماء ويدل عليه الكتاب والسنة الصحيحة المشهورة) لەڕاستیدا سیحر حەقیقەتی هەیەو وەجمهوری زانایانیش و (بگرە) هەموو زانایانیش هەر لەسەر ئەوڕایەن و بەڵگەی قورئان و فەرموودەش لەسەری هەیە( کەئەم ڕاستیە) دەسەلمێنێت (فتح الباری شرح صحيح البخاری ج١١/١٨٩).

(الخطابي)دەربارەی ئەوانەی کەبڕوایان بەهەبوونی سیحر نییە دەڵێ: (فنفي السحر جهل والرد على من نفاه لغو وفضل) کەسێ بڵێ سیحر نییە ئەوە نەفام و نەزانە،هەروەها وەڵامدانەوەی ئەو جۆرەکەسانەش گوتە خەسارکردنە (کات بە فیڕۆدانە)(أعلام السنن فی شرح صحيح البخاری ج٢/١٨٩)

شێخ ئبن جبرين دەڵێت : (اتفق أهل السنة والجماعة علي وجود السحر، وأنه حقيقة تؤثر في الأشياء وتؤذي الإنسان، وأن كل ذلك بإذن الله عز وجل) واتە: هەموو زانایانی ئەهلی سونەت و جەماعەت یەك دەنگن کە لە راستی وهەبوونی جادوو وسیحر و کاریگەری لەسەرشتەکان ولەسەر مرۆڤیش دەبێت. (شرح اعتقاد أهل السنة ج١٥/ ص١)

پ٢٥/ سیحر یان بە فریودانی چاو دەبێت یاخود بەپشت بەستن بە جنۆکەو شەیتان؟

وەڵام/ یەکەم: بەمانای فریودان و نیشانەدانانی شتی ناواقعی دوور لەڕاستی. زانایان دەفەرموون کەجادوکەرانی فیرعەون ئەم جۆرەسحرەیان دەکرد هەروەك لەم ئایەتەپیرۆزەدا هاتووە:( سَحَرُواْ أَعْيُنَ النَّاسِ وَاسْتَرْهَبُوهُمْ ) (ألاعراف:١١٦) واتە:(ساحیرەکانی فیرعەون) جادوویان لەچاوی خەڵکی کردو ویستیان بیانترسێنن ، ئەمەش بەکارێکی(خودعە) فێڵاوی دەکرێت کەحەقیقەت و ڕاستیەکەی دەشارنەوە.

دووەم: بەمانای ڕاکێشانی شەیتانەکان بەشێوازی تایبەت و یارمەتی لێ وەرگرتنیان، خوای گەورەدەفەرموێت: (هل أُنَبِّئُكُم علي مَن تَنَزَّلُ الشّياطين * تَنَزّلُ علي كلِّ أفّاكٍ أثيم * يُلقونَ السَّمع وأكثرُهُم كاذبون) (سورة الشعراء-٢٢١ تا ٢٢٣) واتە: هەواڵتان بدەمێ شەیتانەکان دادەبەزنە سەرکێ؟ دادەبەزنە سەر هەموو (کەسێکی) زۆر درۆزنی زۆر تاوانبار گوێ لەفریشتە ڕادەگرن و، پاشان هەرچی ئەبیسن ئەیدەن بەگوێی فاڵچی و دۆستەکانی خۆیاندا، بەڵام لەهەمانکاتدا زۆربەشیان درۆزنن (تفسير المنار -ج٩/٤١)

## پ٢٦/ جۆرەکانی سیحر چیە؟

وڵام/سیحر چەندین بەشی هەیە لەژێر ناوو ناتۆرەی جیاوازدا،لەبەرئەوەیە(الشنقيطي) ڕەحمەتی خودای لێبێت دەڵێت: ( إعلم أن السحر لا يمكن حده بحد مانع لكثرة الانواع المختلفة الداخلة تحته) باش بزانە: سیحر ناکرێت جۆرەکانی هەر هەمووی دیاری بکرێت بەبێ کەموکوڕی لەبەر هەمەجۆری وجیاوازی جۆرەکانی کە لەژێرەوەی سیحر وجادون (أضواء البيان في إيضاح القرآن بالقرآن ج٤/٣٢٤)

سیحر بەپێی ئەو ئامانجەی سیحرەکەی پێ ئەنجام دەدەرێت دابەش دەبێت هەندێ لەوانە:

١) سحرالتفريق: لێك جیاکردنەوەی ژن و پیاو و کێشەخستنە نێوانیان و تا سەرەنجام بگاتە ئەو ئاستەی کەتەڵاق ڕوودات و خێزان هەڵبوەشێتەوە! ئەمەش بەبەڵگـــەی ئەم ئایــەتە ئەو جـــۆرە سیحرە هەیە هەروەکو لەقورئـــانی پیـــرۆز هـــاتووە: ( فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الْمَرْءِ وَزَوْجِهِ ) (البقرة-١٠٢) واتە: ئەوانیش فێری ئەوە دەبوون لێیانەوە کەوا نێوان ژن و مێردیان پێ جیا دەکردەوە.

٢) سحرالعطف: ئەمەش جۆرێکە لە سیحرو کارێکی سیحریە وا لەبەرامبەر دەکا کەئەوەی خۆشی ناوێت خۆشی بوێ بەرێگای شەیتانی، کەدەبینێ ئافرەتێك پیاوێکی ناوێ(یا بەپێچەوانەوە) وای لێدەکات کەخۆشی بوێ(بێگومان شتێکیش بناغەی زبڵ بێت سەرنجامەکەشی هەرپوچە)! هەر ئەوەشە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) (ئەم جۆرەی) ناو بردووەبە ( التولە ) پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت (إِنَّ الرُّقَي والتمائمَ والتِّوَلَةَ شركٌ) (صححه الألباني في الصحيحة ٣٣١) واتە: (بەڕاستی ڕوقیەی نا شەرعی و چاوەزار و تیوەلە (شتێکە بەکار دەهێندرێت بۆ ئەوەی ژن لەلای مێردەکەی خۆشەویست ببێت) ئەمانە هاوەڵ دانان و شیرکە).

٣) سحر التخییل: ئەو جۆرەش وا لەبەرامبەر دەکات کەشتێك بێجووڵەیە بەڵام ئەو وادەزانێ لەپێش چاوی دەجولێت وە بەپێچەوانەشەوە شتی جووڵاو وا ئەزانێ ڕاوەستاوە هەر وەکو لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە: (فَإِذا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَي )(طه- ٦٦) واتە:گوریس و سیحرەکانیان (هی ساحیرەکانی فیرعەون) وایان لەموسا کرد (علیەالسلام) لەسەرەتادا وای زانی کەهەمووی( لەسەر زگ) دەجولێن (ئەمەش لەبەر بەهێزی سیحرەکانیان)

٤)سحر الخمول: ئەوەش وا لەو کەسەدەکات کەسیحری لێکراوە بەردەوام حەز بەتەنیایی دەکات و بەردەوام بێدەنگ دەبێت و تاقەت و خولکی قسەکردنی نابێت..

٥) سحر الصرف: ئەوەش وا لەبەرکەوتووەکە دەکات کەرقی لەوەبێت کەخۆشیدەوێت ! بۆ نمونە: ژنەکەی لەپێش چاوی پیاوەکەی ناشرین دەکەن یا پیاوەکە لەپێش چاوی ژنەکە ناشرین دەکەن وا دەکات خۆشەویستیان ببێتە بوغزو ڕق لێبوونەوە.(تحصین الإنسان من السحر والجن والشیطان بالأذکار والأوراد والقرآن ٤٥-٤٦)

پ٢٧/ ئەونیشانانە کامانەن کە ساحیرانی پیێ بناسین؟

وڵام/ ١) پرسیار لەناوی خۆی و دایکیدەکات .

٢) شتانێك دەڵێت کەلێ ی تیێ ناگەیت(وورتە وورت دەکات لەبەرەخۆیدا گوایە دوعا دەخوێنی)

٣)شتێك لە(نەخۆشەکە) یا هەرکەسێك بۆ هەر کارێك کەچۆتە لای داوا دەکات کەمووی یان نینۆکی نەخۆشەکە یاخود شتێکی تری لەو جۆرەی بۆ بهێنی.

٤)جاری وا هەیە داوای هێنانی ئاژەڵێك دەکات کەسەری ببڕێت بەڕەنگێکی دیاری کراو بۆنمونە ڕەنگی ڕەش، لیدانی خوێنەکە لەشوێنی ئازارەکە.

٥)شت دەنوسیێ بەشێوازێك کەکەس پیێ ی نەخوێندرێتەوە بەتەلاسم و خەتی چوارگۆشەو سیێگۆشەو ژمارەو بەشێوازی دانانی پاسۆردو کۆد.

٦)شتێك دەدات بە نەخۆشەکە بیکاتە بەری یاخود هەڵی بواسیت ناودەبرێت بە (باڵاپۆش).

٧)وەرەقە دەدات بۆ ئەوەی بیسوتێنی ودوکەڵ بکات ویاخود هەڵی بواسێت یان بی خاتە ژێرخۆڵەوە.

٨) داواکردنی پارچە قوماش یاخود کەلوپەل لەنەخۆش.

٩) سەربڕینی ئاژەڵ یاخود باڵندە بیێ ئەوەی ناوی خودای لەسەر بهێنرێت.

١٠) جاری وا هەیە ناوی خۆی و بابی و یا دایکی و ئەو شوێنەیکەلێیەوەی هاتووە یا ئەو ئیشەی کەبۆی هاتووە ئاشکرای دەکات(بەیارمەتی شەیاتینەکانی ژێردەستی)! کەبەرامبەر تووشی شۆك دەکات و

سەرسامی دەکات،وای لێدەکات کەبڕوا بەقسەکانی بکات و ڕێنماییەکانی جێبەجێ بکات

.(أربعون درسا لمن أدرك رمضان- ٩٨)

پ٢٨/ ئەو ڕێگایانەی کەساحیر وجادوگەر دەیگرێتەبەر بۆنزیکبوونەوە لەشەیتان؟

وڵام/ ١. هەندێکیان ئایەتی قورئانی پیرۆز لەسەر نەعل دادەنێن و لەپێی دەکان بۆ شوێنی نەشیاو(پەنا بەخودا)

٢. هەندێکیان: بەخوێنی پیس ئایەتی قورئانی پیرۆز دەنوسێتەوە.

٣- هەیانە: بۆ شەیتان ئاژەڵ سەردەبڕێت (بسم الله) ناکات لەسەری.

٤)هەندێکیان: فاتیحە بەپێچەوانەوە دەنوسێتەوەو بەپێچەوانەوەش دەیخوێنێتەوە.

٥)هەندێکیان : نوێژ دەکات بەڵام بەبێ دەستنوێژ.

٦)هەندێکیان بەبەردەوامی غوسلی جەنابەتی لەسەرەو خۆی ناشوات بەتەواوی بەجەنابەو لەش گرانی دەمێنێتەوە.

٧)هەندێکیان (پەنا بەخودا)سوژدە دەبات بۆ ئەستێرە یان مانگ و ڕۆژ یاخود بتی تایبەتی‌خۆی .

٨)هەندێکیان لەگەڵ مەحرەمی خۆی جووت دەبێت (وەك:دایك و خوشك و.هتد ).

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت شەیتان بە گوێ جادوگەر ناکات تاوەکو فرمانەکانی جێ بەجێ نەکات ئەو کارە کوفرو بێ باوەڕیانە ئەنجام نەدات ،تاوەکو جادووگەر کوفری گەورە بکات ئەوە زیاتر شەیتان بە گوێ ی دەکات و فرمانەکانی جێ بەجی دەکات.(الصارم البتار في التصدي للسحرة الأشرار ٨)

## پ٢٩/ حوکمی ساحیر وجادووگەر؟

ولّام /زانایانیش ڕایان جیاوازە لەبارەی حوکمی جادووگەرانەوە، کە ئایا ئەگەر دەستگیرکران داوای تەوبەیان لیّ دەکریّت و تەوبەکەیان لیّ قبولّ دەکریّت، یان دەست بەجیّ دەکوژریّن بەبیّ ئەوەی داوای تەوبەیان لیّ بکریّت لەکاتیّکدا کە سەلما لەسەریان جادوویان کردووە ؟ بیّگومان ڕای دووەم ڕاستر و پەسەندترە چونکە مانەوەی ئەو جۆرە کەسانە زیان دەگەیەنیّت بە کۆمەلّگە، و زۆرجاریش ئەو جادووگەرانە ڕاستگۆ نیین لە تەوبەکردن، هەروەها مانەوەی ئەم جادووگەرانە مەترسیدارە بۆ سەر موسلّمانان، ئەو زانایانەیش کە ئەم ڕایەیان هەیە بەلّگە بۆ ووتەکەیان بەوە دەهیّننەوە: (عن عمرَ رضي الله عنه أنه كتب إلي عمَّالِه في الشَّامِ أن يقتلوا السَّحرةَ)(صحيح-تخريج مشكل الآثار لشعيب الأرناؤوط - الصفحة ١٢٩/٨ )

واتە: عومەری کوڕی خەتاب (خوای لیّ ڕازی بیّت) فەرمانی کردووە بە کوشتنی سەرجەم جادووگەرەکان و داوای تەوبەکردنیشی لیّ نەکردوون، عومەریش دیارە کە خەلیفەی دووەمی ناو خەلیفە ڕاشدینەکانە، کە پیّغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی بە موسلّمان کردووە شویّن سوننەت و کاروکردەوەیان بکەون، هەروەها یەکیّکی تر لە بەلّگەکانیان ئەوەیە ئیمامی تورموزی ڕیوایەتی کردووە لە جوندوبی کوڕی عەبدوللّای بەجەلیەوە، یان لە جوندوب ولخەیری ئەزدیەوە بە فەرموودەیەکی مەرفوع و مەوقوفیش ڕیوایەتیان کردووە کە فەرموویەتی : (حدُّ الساحِرِ ضربَةٌ بالسَّيْفِ) قال الالباني في تخريج مشكاة المصابيح الصواب عن جندب موقوفا ٣٤٨٢ واتە: سزا و حەدی جادووگەر لەگەردن دانیەتی بە شمشیّر، هەندیّك لەوانەی فەرمودەکە دەگیّڕنەوە بەم شیّوەیە فەرموودەکەیان لەبەر کردووە، ڕای ڕاستیش لەبارەی ئەم فەرمودەوە ئەوەیە ئەم ووتەیە ووتەی جوندوب خۆیەتی، واتا مەوقوفە.

لە حەفصەی دایکی باوەڕدارانیشەوە (خوای لێ ڕازی بیت) بەصەحیحی گێڕراوەتەوە (أنها قتلت جاريةً لها لما علِمَت أنها تسحرُ) مجموع فتاوي ابن باز٢/١٢٠

واتە: فەرمانی کردووە بە کوشتنی کەنیزەکێکی خۆی لەسەر ئەوەی کە جادووی لێکردبوو، بەبی ئەوەش کە داوای تەوبەی لیّ بکات، کەواتە ئەم مەسئەلەیە لە سێ کەسی بەرێزی ناو هاوەڵانەوە ڕیوایەت کراوە، عومەر و جوندوب و حەفصە .

پ٣٠/حەڕامیەتی چوونە لای جادووگەر و فاڵچی و شوێن هەڵگرو کاهن وڕاهب؟

وڵام/ عَنْ بَعْضِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ (ﷺ) عَنِ النَّبِيِّ ( صلي اللة علية وسلم ) قَالَ « مَنْ أَتَي عَرَّافًا فَسَأَلَهُ عَنْ شَيْءٍ لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلاَةٌ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً » (صحيح مسلم ٥٩٥٧)

واتە : هەندێك لە خێزانەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموون ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : هەر کەسێك بچێتە لای شوێن هەڵگرێك پرسیاری شتێکی لێبکات ئەوا چل شەو هیچ نوێژێکی لیّ قەبوڵ ناکرێت .

ئیمامی نەوەوی سەبارەت بە شەرحی ئەم فەرموودەیە دەفەرموێت مانای قەبوڵ نەبوونی نوێژەکانی بۆ ماوەی چل ڕۆژ واتە وەرنەگرتنی پاداشت ، بەڵام نوێژە فەرزەکانی لە ئەستۆ لا دەچێت ، بۆیە پێویست بە دووبارەکردنەوەی ئەو نوێژانە ناکات کە لەم چەند ڕۆژە ئەنجامیداوە .(المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج : ٢٢٩/١٤ ).

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ (ﷺ) ، قَالَ: (مَنْ أَتَي عَرَّافًا أَوْ كَاهِنًا، فَصَدَّقَهُ بِمَا يَقُولُ، فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَي مُحَمَّدٍ) (صحيح الجامع٥٩٣٩) واتە : لە ئەبو هوریرەوە(ڕەزای خوای گەورەی لێبێت) فەرمووی ،پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی : هەرکەسێك بچێتە لای شوێن هەڵگرێك ( بۆ پرسیارکردنی شتێکی بزر بووی ) یان بچێتە لای کاهینێك (قەشەیەك ) بۆ

نوشتەیەکی سحر، ئینجا باوەڕی پێبکات بەوەی دەیڵێت ، ئەوە بە تەئکید بێ باوەڕ بووە بەو قورئانەی بە سەر موحەمەد (صلى الله عليه وسلم) دابەزیوە .

عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ الْحَكَمِ السُّلَمِيِّ ، قَالَ : قُلْتُ : يَا رَسُولَ اللهِ ، أُمُورًا كُنَّا نَصْنَعُهَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ ، كُنَّا نَأْتِي الْكُهَّانَ ، قَالَ : فَلاَ تَأْتُوا الْكُهَّانَ ، قَالَ : قُلْتُ : كُنَّا نَتَطَيَّرُ ، قَالَ : ذَاكَ شَيْءٌ يَجِدُهُ أَحَدُكُمْ فِي نَفْسِهِ ، فَلاَ يَصُدَّنَّكُمْ ﴾ مسلم (٢٢٣٠) ، وأحمد (٤/٦٨ ، ٥/٣٨٠) . واتە : لە موعاویەی کوڕی حەکەمی سولەمی ڕەزای خوای پەروەردگاری لێبێت ، ووتی : ووتم ئەی پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) هەندێك شت ئێمە ئەنجامانددا لەسەردەمی نەفامیدا ، ئێمە دەچوینە لای جادوگەران ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی مەچنە لای جادوگەران ، ووتم : ئێمە باوەڕمان بە تەیر هەڵفڕین هەبوو (واتە : ئەگەر ویستی کارێکمان هەبوایە ئەوا باڵندەیەکمان دەهێنا و بەرەڵامان دەکرد و هەڵمان دەفڕاند ، جا ئەگەر ئەو باڵندەیە بەرەو لای ڕاست هەڵفڕیبا ئەوا کارەکەمان دەکرد ، وە ئەگەر باڵندەکە بەرەو لای چەپ هەڵفڕیبا ئەوا کارەکەمان نەدەکرد و وازمان لێ دەهێنا ) ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : ئەوە شتێکە بەهۆی گومانی نەفسی خۆتان یەکێك لە ئێوە توشی دەبێت و گوێڕایەڵی ئەو گومانە خراپەی دەکات ، با تەیر هەڵفڕین یان دەنگی تەیر نەبێتە ڕێگر لە ڕۆیشتنتان بەرەو کار و سەفەرتان .

قَالَتْ عَائِشَةُ سَأَلَ أُنَاسٌ رَسُولَ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنِ الْكُهَّانِ فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) لَيْسُوا بِشَيْءٍ قَالُوا :( يَا رَسُولَ اللهِ فَإِنَّهُمْ يُحَدِّثُونَ أَحْيَانًا بِالشَّيْءِ يَكُونُ حَقًّا ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ تِلْكَ الْكَلِمَةُ مِنَ الْحَقِّ يَخْطَفُهَا الْجِنِّيُّ فَيَقُرُّهَا فِي أُذُنِ وَلِيِّهِ قَرَّ الدَّجَاجَةِ فَيَخْلِطُونَ فِيهَا أَكْثَرَ مِنْ مِئَةِ كَذْبَةٍ ). (صحيح البخاري -٦٢١٣ ، ومسلم -٥٩٥٣.)

واته : عائیشەی دایکی باوەڕداران (ڕەزای خوای گەورەی لێبێت ) فەرمووی : هەندێك له خەڵکی پرسیارییان له پێغەمبەری خوا کرد (صلى الله عليه وسلم) سەبارەت به کاهینەکان ، له وەڵامدا فەرمووی : کاهینەکان هیچ شتێك نین و هیچیان به دەست نییه ، وتیان ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەندێك جار قسه لەسەر شتێك دەکەن یەکسەر ڕاست دەردەچێت ، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : ئەو ووشه ڕاستەی ئەوان دەیڵێن ئەوە جنۆکەیەکه ئەم ووشەیه له قسەی فریشتەکان دەدزێت ئینجا دێت وەکو دەنگی مریشك ئەم قسەیه له گوێی دۆستەکەی دەخوێنێت ، پاشان ئەوانیش واته (دۆستانی جنۆکەو شەیاتینەکان لەجادوگەر و کاهینەکان) له گەڵ ئەم قسەیه زیاتر له سەد درۆ تێکەڵ دەکەن ئینجا دێن قسه بۆ خەڵك دەکەن .

عَنْ عَائِشَةَ - رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا - زَوْجِ النَّبِيِّ ( صلي اللة علية وسلم ) أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُولَ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ : ( إِنَّ الْمَلاَئِكَةَ تَنْزِلُ فِي الْعَنَانِ ، وَهْوَ السَّحَابُ - فَتَذْكُرُ الأَمْرَ قُضِيَ فِي السَّمَاءِ فَتَسْتَرِقُ الشَّيَاطِينُ السَّمْعَ فَتَسْمَعُهُ فَتُوحِيهِ إِلَي الْكُهَّانِ فَيَكْذِبُونَ مَعَهَا مِئَةَ كَذْبَةٍ مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِهِم ). (صحيح البخاري: ٣٢١٠). واته : له عائیشەی دایکی باوەڕدانەوە (ڕەزای خوای گەورەی لێبێت) گوێی له پێغەمبەری خوا بووە (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی : فریشتەکان دادەبەزنه ناو هەورەکانی ئاسمانی دونیا ، بۆ یەکتری باسی ئەو فەرمانانه دەکەن که خوای گەورە سەبارەت به ڕووداوەکانی دونیا بڕیاری لەسەر داوە ، ئینجا شەیاتینەکان دێن گوێ له فریشتەکان دەگرن ئەوەی لێیان دەبیستن یەکسەر بۆ کاهینەکانی دەدزن و بۆیان دەبەن ، کاهینەکانیش لای خۆیان سەد درۆی تێکەڵ دەکەن .

وعن عمران بن حصين رضي الله عنه قالَ : قالَ رسولُ الله (صلى الله عليه وسلم) (لَيْس مِنَّا مَنْ تَطَيَّرَ أَوْ تُطُيِّرَ لَهُ، أَوْ تَكَهَّنَ أَوْ تُكُهِّنَ لَهُ، أَوْ سَحَرَ أَوْ سُحِرَ لَهُ. وَمَنْ أَتَي كَاهِنًا فَصَدَّقَهُ بِمَا يَقُولُ، فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَي مُحَمَّدٍ صَلَّي اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) (صحيح الترغيب والترهيب: ٣٠٤١)

واتە : لە عیمرانی کوڕی حوسەینەوە (ڕەزای خوای گەورەی لێبێت ) فەرمووی : پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : لە ئێمە نییە ئەوکەسەی بە مەبەستی خێر و شەڕ لە کارەکانیدا (لەسەردەمی نەفامیدا کەسانێك هەبوون ئەگەر نیازی سەفەرێکیان هەبووایە باڵندەیەکیان دەهێنا و هەڵیان ئەفراند ئەگەر باڵندەکە بۆلای ڕاست بفڕییایە ئەوە سەفەرەکەیان دەکرد ، بەڵام ئەگەر بەلای چەپدا ڕۆیشتبا سەفەرەکەیان نەدەکرد) باڵندە هەڵدەفڕێنێت ، یان داوا لە غەیری خۆی بکات باڵندەی بۆ هەڵفڕێنێت ، وە لە ئێمە نییە ئەوکەسەی بانگەشەی زانستی غەیب بکات ، یان بانگەشەی بۆ بکرێت و ئەویش پێی ڕازی بێت ، وە لە ئێمە نییە ئەوکەسەی خۆی فێری سحر بکات وسحر لە خەڵکی بکات ، یان داوا لە کەسێك بکات سحری بۆ بکات ، وە هەر کەسێك بچێتە لای کاهینێك ( ئەوەی کە بانگەشەی عیلمی غەیب دەکات ) و بەڕاستی دابنێت ئەو قسانەی دەیڵێت ، ئەوە بێباوەڕ بووە بەو قورئانەی بەسەر موحەمەد (صلى الله عليه وسلم) دابەزیوە .

عَنْ أَبِي مَالِكٍ الْأَشْعَرِيِّ أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «أَرْبَعٌ فِي أُمَّتِي مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ، لَا يَتْرُكُونَهُنَّ: الْفَخْرُ فِي الْأَحْسَابِ، وَالطَّعْنُ فِي الْأَنْسَابِ، وَالِاسْتِسْقَاءُ بِالنُّجُومِ، وَالنِّيَاحَةُ» (صحيح مسلم: ٢٢٠٣). واتە : لە ئەبو مالیکی ئەشعەریەوە ( ڕەزای خوای گەورە لێبێت ) فەرمووی : پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : چوار شت هەیە لەناو ئوممەتەکەمدا کە لە کار و پیشەی سەردەمی نەفامیە ، ئوممەتەکەم وازی لێناهێنن ، یەکەمیان خۆ هەڵدانەوە بە عەشیرەت و نەسەبەکەی بەسەر غەیری خۆی ، دووەمیان قسە ووتن و ڕەخنە گرتن لە

ڕەچەڵەکی خەڵك ، سێیەمیان  دانە پاڵی باران بارین بۆ لای ئەستێرەکان و باوەڕبوون بەوەی ئەستێرەکان باران دەبارێنن یان هۆکاری باران بارینن ، چوارەمیان  پیاهەڵکردن و ڕۆ ڕۆ کردن بۆ مردووان .

عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ رضي الله عنه ،أَنَّهُ قَالَ: (صَلَّي لَنَا رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) صَلاَةَ الصُّبْحِ بِالْحُدَيْبِيَةِ ، عَلَي إِثْرِ سَمَاءٍ كَانَتْ مِنَ اللَّيْلَةِ ، فَلَمَّا انْصَرَفَ ، أَقْبَلَ عَلَي النَّاسِ ، فَقَالَ : هَلْ تَدْرُونَ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ ؟ قَالُوا : اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ ، قَالَ : أَصْبَحَ مِنْ عِبَادِي مُؤْمِنٌ بِي وَكَافِرٌ ، فَأَمَّا مَنْ قَالَ :مُطِرْنَا بِفَضْلِ اللهِ وَرَحْمَتِهِ ، فَذَلِكَ مُؤْمِنٌ بِي ، وَكَافِرٌ بِالْكَوْكَبِ ،وَأَمَّا مَنْ قَالَ:بِنَوْءِ كَذَا وَكَذَا، فَذَلِكَ كَافِرٌ بِي ،وَمُؤْمِنٌ بِالْكَوْكَبِ) (البخاري -١/٢٩٠ ،مسلم -٢/٥٩-٦٠).

واتە: لە زەیدی کوڕی خالدی جوهەنیەوە ڕەزای خوای پەروەردگاری لێبێت فەرمووی : پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نوێژی بەیانی بۆ ئێمە کرد لە (حديبيه) ، ئەم نوێژەی لە دوای باران بارین بۆ کردین کە لە شەو باری بوو ، ئینجا کاتێك لە نوێژەکە تەواو بوو ، ڕووی خۆی وەرگێڕا بۆ لای خەڵك و، فەرمووی : ئایا دەزانن پەروەردگاری ئێوە چی فەرموو ؟ ووتیان : خوا و پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەزانن ، ووتی : هەندێك لە بەندەکانی من باوەڕدار بوون پێم وە هەندێکیشیان بێ باوەڕ بوون پێم ، جا هەر کەسێك بڵێت باران بۆ ئێمە باری بە فەزڵ و ڕەحمەتی خوا ، ئەوا ئەو کەسە باوەڕدارە بە من ، وە بێ باوەڕە بە ئەستێرەکان ، بەڵام ئەو کەسەی بڵێت باران بۆ ئێمە باری بەهۆی ئاوا بوونی ئەستێرە یان دەرکەوتنی ئەستێرە واتە باران بارینەکە بداتە پاڵ ئەستێرەکە نەك خوای پەروەردگار ، ئەو کەسە بێ باوەڕ بووە بە من ، وە باوەڕدار بووە بە ئەستێرەکان .

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)  قَالَ « مَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِنْ بَرَكَةٍ إِلاَّ أَصْبَحَ فَرِيقٌ مِنَ النَّاسِ بِهَا كَافِرِينَ يُنْزِلُ اللَّهُ الْغَيْثَ فَيَقُولُونَ الْكَوْكَبُ كَذَا وَكَذَا » وَفِي حَدِيثِ الْمُرَادِيِّ

« بِكَوْكَبِ كَذَا وَكَذَا ». (صحيح مسلم: ٢٤٢). واته : لەئەبو هورەیرەوە فەرمووی : پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: خوای گەورە هیچ بەرەكەتێك دانابەزێنێت ئیللا هەندێك لە خەڵكی بێ باوەڕ دەبن پێی ، خوای گەورە باران دەبارێنێت ، بەڵام ئەوان دەڵێن فڵانە ئەستێرەیە باراندوویەتی ، یان بەهۆی فڵانە ئەستێرە وە باریوە.

عن ابْنُ عَبَّاسٍ قَالَ مُطِرَ النَّاسُ عَلَي عَهْدِ النَّبِيِّ (صلی الله علیه وسلم) فَقَالَ النَّبِيُّ (صلی الله علیه وسلم) « أَصْبَحَ مِنَ النَّاسِ شَاكِرٌ وَمِنْهُمْ كَافِرٌ قَالُوا هَذِهِ رَحْمَةُ اللَّهِ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ لَقَدْ صَدَقَ نَوْءُ كَذَا وَكَذَا ».قَالَ فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ (فَلاَ أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ) حَتَّي بَلَغَ (وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ) [الْوَاقِعَةِ: ٧٥-٨٢] ) (صحيح مسلم: ٢٤٣).واته: لە ئیبن عەبباسەوە فەرمووی : لەسەردەمی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خەڵكی بارانیان بۆ باری ، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: هەندێك لە خەڵكی شوكرانە بژێری خوا بوون و وە هەندێكیان بێباوەڕبوون ، شوكرانە بژێر و باوەڕدارەكان ووتیان: ئەم باران بارینە بەزەیی خوای گەورەیەو خوای گەورە باراندوویەتی ، هەندێك لە خەڵكی بێ باوەڕیش ووتیان: ئەم بارانە فڵانە ئەستێرە باراندوویەتی ، ئینجا خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند: (فَلاَ أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ) هەتا (وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ ) . واته: (سوێند بە جێو شوێنی ئەستێرەكان ) ...( ئێوە شوكرانەی ڕۆزیەكەتان دەگۆڕن بە كوفرانەی نیعمەت و ئەڵێن بەهۆی فڵانە ئەستێرەوە باران دەبارێ ) .

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلی الله علیه وسلم)(مَنِ اقْتَبَسَ عِلْمًا مِنَ النُّجُومِ اقْتَبَسَ شُعْبَةً مِنَ السِّحْرِ زَادَ مَا زَادَ)(رواه أبو داود : الطب /٣٩٠٥)،( وابن ماجه :الأدب /٣٧٢٦) ،(وأحمد :١/٢٢٧، ١/٣١١)

واته: عبداللّه ی كوڕی عباس (ڕەزای خوای گەورەی لێبێت) فەرمووی : پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی : هەر كەسێك زانستێك فێر بێت لە زانستی ئەستێرەكان ئەوە ئەو كەسە

بەشێك لە سیحری وەرگرتووە ، جا چەند زیاتر زانستی ئەستێرەکان وەربگریت وە فێر بیت ئەوە زیاتر سیحر فێر بووە یان وەری گرتووە ، وە زیاتر تاوانی بۆ خۆی زیاد کردووە .

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ، رضي الله عنه ، عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: ( اجْتَنِبُوا السَّبْعَ الْمُوبِقَاتِ ، قَالُوا : يَا رَسُولَ اللهِ ، وَمَا هُنَّ ؟ قَالَ : الشِّرْكُ بِاللهِ ، وَالسِّحْرُ ، وَقَتْلُ النَّفْسِ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلاَّ بِالْحَقِّ ، وَأَكْلُ الرِّبَا ، وَأَكْلُ مَالِ الْيَتِيمِ ، وَالتَّوَلِّي يَوْمَ الزَّحْفِ ، وَقَذْفُ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ الْغَافِلاَتِ﴾ (أخرجه البخاري في (كتاب الوصايا ، باب قول الله تعالي :{إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا} ٥/ ٣٩٣/ ٢٧٦٦) ، ومسلم في الإيمان ، باب بيان الكبائر وأكبرها، ١/ ٩٢/ ٨٩)

واتە : لە ئەبو هرەیرەوە ڕەزای خوای پەروەردگاری لێبێت لە پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی : خۆتان بە دوور خەن لە حەوت بە هیلاك بەرەکان ، (واتە ئەو حەوت تاوانانەی کە مرۆڤ بە هیلاك دەبات لە دونیا و لە قیامەت) ، ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەو حەوت بە هیلاك بەرانە چین؟ فەرمووی شەریك بۆ خوا دانان ، وە سیحر ، وە کوشتنی نەفسێك کە خوای پەروەردگار بە حەرامی دانابێت بکوژرێت تەنها بە حەقی خۆی نەبێت ، ، وە خواردنی پارەو ماڵی ڕیبا ، وە خواردنی ماڵی یەتیمی بێ باوك ، وە پشت هەڵکردن و ڕێ کردن لە جیهاد ، وە بوهتان کردن بەو ئافرەتانەی کە داوێن پاکن و باوەڕدار و بێ ئاگان لە کاری خراپ.

پ٣١/ چۆنیەتی خۆپاراستن لە سیحر و جادوو؟

وڵام/ ١) ئەنجامدانی هەموو کردەوە فەرزکراوەکان و وازهێنان و دوور کەوتنەوە لە هەموو حەرام و قەدەغەکراوەکان، و تەوبەیەکی ڕاستەقینە و پاك لە هەموو تاوانەکان.

٢ ـ زۆر خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بە شێوەیەك كە ڕۆژانە ئەندازەیەكی دیاری كراوی لێبخوێت و بیكات بە ویردی ڕۆژانەی.

٣.خوێندنەوەی (سورة البقرة) بە كاملّی لە مالّدا (چ كەسێك بیخوێنێت یان بە كاسێت لێبدرێت)، چونكە پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (اقرءوا سورة البقرة في بيوتكم فإنّ الشيطان لا يدخل بيتاً يقرأ فيه سورة البقرة)) صحيح الـجامع الصغير رقم: (١١٧٠)

واتە: لە ناو مالّەكانتاندا (سورة البقرة) بخوێننەوە چونكە شەیتان ناچێتە ناو مالّێكەوە كەوا (سورة البقرة)ی تێدا بخوێنرێت.

٤.خۆ قایم كردن بە خوێندنەوەی دوعا و وێردەكانی پەناگرتن بەخودا و زیكرە شەرعیەكان، بە تایبەت ئەم زیكرانە: زیكری بەیانیان و ئێواران، زیكری دوای نوێژە فەرزەكان، زیكری پێش خەوتن و پاش لە خەو هەستان، زیكری لە مالّ دەرچوون و هاتنە ژوورەوە بۆ مالّ، زیكری پێش جلوبەرگ داكەندن و پاش لەبەر كردنی، زیكری پێش چوونە سەر ئاو و پاش دەرچوونە دەرەوە لە سەر ئاو، هەروەها هەموو زیكرەكانی تر كە لە سوونەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هاتووە، بۆ ئەم مەسەلەیە دەتوانیت سوود ببینیت لەم كتێبە: (حصن الـمسلم من أذكار اليوم والليلة). وە بۆ خۆپارێزی لە (سیحر و جادوو) دەبێت ئەم زیكرانە بخوێنیت بە تایبەت: (بسم الله الذي لا يضر مع اسمه شيء في الأرض ولا في السماء وهو السميع العليم) سێ جار بەیانیان پێش خۆر كەوتن و ئێواران پێش خۆر ئاوا بوون، خوێندنەوەی (آية الكرسي (اللّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لاَ تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلاَ نَوْمٌ لَّهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلاَ يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِ إِلاَّ بِمَا شَاء وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَلاَ يَؤُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ) (سورة البقرة: ٢٥٥) لە دوای هەموو نوێژە فەرزەكان و بەیانیان و

ئێواران و لە پێش خەوتنیش، خوێندنەوەی هەر سێ سورەتی: (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ...)و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ...) و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ ...) سێ جار سێ جار بەیانیان و ئێواران و لە پێش خەوتنیش.

خوێندنەوەی (لا إله إلا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد وهو علي كل شيء قدير) هەموو ڕۆژێك (١٠٠) سەد جار، وە بە تایبەت بۆ تۆ زۆر پێویستە کەوا کەمتەرخەم نەبیت لە زیکرەکانی پێش خەوتن وە بە تایبەت تریش (آية الكرسي) و (دوو ئایەتی کۆتایی سورە البقرە: (آمن الرسول بما أنزل إليهِ ...) و هەر سێ سورەتی: (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ...)و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ...) و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ ...) ئەگەر هەموو ئەم کارانەت ئەنجام دا لە گەل پشت بەستن بە خواوە ئەوا بە ویستی خوا پارێزراو دەبێت لە زیانی (سیحر و جادوو) و چاوی پیس.

٥ ـ خواردنی (٧) دەنکە (خورمای عەجوە) لە بەیانیاندا، چونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:(من اصطبح بسبع تمرات عجوة لم يضره ذلك اليوم سَم ولا سحر) ( البخاري - ٥٧٧٩)(صحيح مسلم-٢٠٤٧). واتە: هەر کەسێك بەیانیان (٧) حەوت (خورمای عەجوە) بخوات ئەوا لەو ڕۆژەدا نە سەم و نە سیحر زیانی پێ ناگەیەنێت ،شێخ بنباز دەفەرمویت : دەڵێت داوەکارم لە خودا ئەگەر کەسێك دەستی نەکەوت هەر خورمایەکی تر بخوات خودا بیکاتە شیفای. (العلاج بالرقى من الكتاب والسنه-ص ٨٣-٨٧)

هەروەها ئەم دوور کارەی خوارەوەش خۆپارێزیان پێ دەکرێت لە تووش بوون بە سیحر و چاوی پیس وجنۆکە:

یەکەم/ نابێت بە هیچ شێوەیەك وێنەی گیان لەبەر لە ماڵتاندا هەبێت،چونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)فەرموویەتی:( إنّ الملائكة لا تدخل بيتاً فيه كلب ولا صورة) (صحيح الجامع ١٩٦٣). واتە:

بەڕاستی فریشتەکان ناچنە ناو ماڵێکەوە کەوا سەگی تێدا بێت یان وێنە، جا ئەگەر بە هۆی وێنەوە فریشتەکان نەچنە ناو ماڵێکەوە ئەوا ئەو ماڵە دەبێتە جێگای شەیتان و جنۆکەکان.

دووەم/نابێت بە هیچ شێوەیەك لە ماڵدا گۆرانی و مۆسقا لێبدرێت، چونکە گوێ گرتن لە گۆرانی و مۆسقا تاوانە و سەرپێچی فەرمانی خوایە و فریشتەکان و ئیمانداران بێزار دەکات، وە بە پێچەوانەوە گۆرانی و مۆسقا شەیتان و جنۆکەکان دڵ خۆش دەکات و هاندەریانە بۆ کاری خراپە و تاوان.

پ٣٢/ چارەسەر کردنی نوشتەی سیحر و کەسی جادوو لێ کراو چۆن دەبێت؟

وڵام/ ئەمەش چەند جۆرێکە :

جۆری یەکەم دەرهێنانی ئەو شتەی کە سیحرەکەی پێکراوە و هەڵوەشاندنەوەی ئەگەر شوێنەکەی زانرا بە ڕێگای دروستەکان.

جۆریەی دووەم :خوێندنەوەی عیلاجی شەرعی بە سەر تووشبووەکە و بەکارهێنانی چارەسەر چەند ڕێگەیەکی هەیە  کەپێکهاتووە لەمانەی خوارەوە:

١)کوتانی (٧) حەوت گەڵای سەوزی تەڕی دار نەبك (سیدر) بە دوور بەرد ئەنجا ئەوەندە ئاو بکرێت بە سەریدا کەوا لێ ی بخورێت وبەشی خۆپێشۆردن بکات و ئەنجا ئەم ئایتانە بخوێنرێت بە سەر ئەو ئاوەدا:

(أعوذُ باللهِ من الشيطان الرجيم) اللهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لاَ تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلاَ نَوْمٌ لَّهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلاَ يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِ إِلاَّ بِمَا شَاء وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَلاَ يَؤُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ) ( البقرة-٢٥٥)

وَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنْ أَلْقِ عَصَاكَ فَإِذَا هِيَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ (١١٧) فَوَقَعَ الْحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ (١١٨) فَغُلِبُواْ هُنَالِكَ وَانقَلَبُواْ صَاغِرِينَ (١١٩) وَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سَاجِدِينَ (١٢٠) قَالُواْ آمَنَّا بِرِبِّ الْعَالَمِينَ (١٢١) رَبِّ مُوسَى وَهَارُونَ (١٢٢) (سورة الأعراف)

(وَقَالَ فِرْعَوْنُ ائْتُونِي بِكُلِّ سَاحِرٍ عَلِيمٍ (٧٩) فَلَمَّا جَاء السَّحَرَةُ قَالَ لَهُم مُّوسَى أَلْقُواْ مَا أَنتُم مُّلْقُونَ (٨٠) فَلَمَّا أَلْقَواْ قَالَ مُوسَى مَا جِئْتُم بِهِ السِّحْرُ إِنَّ اللّهَ سَيُبْطِلُهُ إِنَّ اللّهَ لاَ يُصْلِحُ عَمَلَ الْمُفْسِدِينَ (٨١) وَيُحِقُّ اللّهُ الْحَقَّ بِكَلِمَاتِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُجْرِمُونَ (٨٢) (سورة يونس)

(قَالُوا يَا مُوسَى إِمَّا أَن تُلْقِيَ وَإِمَّا أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَلْقَى (٦٥) قَالَ بَلْ أَلْقُوا فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَى (٦٦) فَأَوْجَسَ فِي نَفْسِهِ خِيفَةً مُّوسَى (٦٧) قُلْنَا لَا تَخَفْ إِنَّكَ أَنتَ الْأَعْلَى (٦٨) وَأَلْقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوا إِنَّمَا صَنَعُوا كَيْدُ سَاحِرٍ وَلَا يُفْلِحُ السَّاحِرُ حَيْثُ أَتَى (٦٩) فَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سُجَّدًا قَالُوا آمَنَّا بِرَبِّ هَارُونَ وَمُوسَى (٧٠) (سورة طه)

**خوێندنەوەی سورەتەکانی** (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ) (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ) (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ) **ئەوجا دوای خوێندنەوەی هەموو ئەم ئایەتانە بەسەر ئاوەکەدا سێ جار لێی دەخۆیتەوە و پاشان بە باقیەکەی خۆت دەشۆریت بەویستی خودا چاك دەبیتەوە، وە ئەگەر پێویستی کرد دووبارە و سێ بارە بکرێتەوە هیچی تێدا نییە تاوەکو چاك دەبێتەوە.**

**هەروەها ئەم ئایەتانە بخوێنەرەوە: (سورة الفاتحة)، (آية الكرسي) (دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی البقره)** (آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللّهِ وَمَلآئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ وَقَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾ لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَا إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلاَ تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلاَ تُحَمِّلْنَا مَا لاَ طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَآ أَنتَ مَوْلاَنَا فَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ﴿٢٨٦﴾

سێ جار خوێندنەوەی سورەتی (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) و(قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ) و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ) و (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ) لە گەڵ فووپێداکردن و دەست هێنان بە سەر جێگای ئازارەکەدا بە دەستی ڕاست

**٢)خوێندنەوەی دوعا و ئەو زیکرە گشتیانەی کە پەنایان پێدەگرێت بەخودای گەورە**

*(أسأل الله العظيم رب العرش العظيم أن يشفيك) حەوت جار

*نەخۆشەکە دەستی ڕاستی دەخاتە سەر ئەو شوێنەی کە ئازاری هەیە لە لاشەیدا و سێ جا دەڵێت: (بسم الله)، ئەنجا حەوت جار دەڵێت: (أعوذ بالله وقدرته من شر ما أجد وأحاذر).

* (رب الناس أذهب البأس واشفِ أنت الشافي لا شفاء إلاَّ شفاؤك شفاء لا يغادر سَقماً)

* (أعوذ بكلمات الله التامة من كل شيطان وهامة ومن كل عين لامة)

* (أعوذ بكلمات الله التامات من شَرِّ ما خلق)

*(أعوذ بكلمات الله التامات من غضبه وعقابه وشرعباده ومن همزات الشياطين وأن يحضرون)

*(أعوذ بكلمات الله التامات التي لا يجاوزهن بر ولا فاجر من شر ما خلق وذرأ وبرأ ومن شر ما ينـزل من السماء ومن شر ما يعرج فيها، ومن شر ما ذرأ في الأرض وبرأ ومن شر ما يخرج منها، ومن شر فتن الليل والنهار، ومن شر كل طارق يطرق إلاَّ طارقاً يطرق بخير يا رحمن)

*(اللهم رب السموات السبع ورب العرش العظيم ربنا ورب كل شيء، فالق الحب والنوي، منـزل التوراة والإنجيل والقرآن أعوذ بك من شر كل شيء أنت آخذ بناصيته، أنت الأول فليس قبلك شيء وأنت الآخر فليس بعدك شيء وأنت الظاهر فليس فوقك شيء وأنت الباطن فليس دونك شيء) *(بسم الله أرقيك من كل شيء يؤذيك من شر كل نفس أو عين حاسد الله يشفيك، بسم الله أرقيك)

* (بسم الله يبريك، ومن كل داء يشفيك، ومن شر حاسد إذا حسد، ومن شر كل ذي عين)

* (بسم الله أرقيك من كل شيء يؤذيك، من حَسدِ حاسدٍ ومن كل ذي عين، الله يشفيك)

٣) وەهەروەها کەڵەشاخ کردنی ئەو شوێنانەی شوینی سیحری لەسەر دەردەکەوێت ئەگەر توانا هەبوو ئەگەر نەتوانرا ئەوانەی پێشوو بەسە بۆچارەسەر ان شاء الله.

٤) ئەمەش ڕێگەیەکی تری چارەسەرە بەکارهێنانی هەندێ دەواو دەرمانی گیایی وسروشتی لەلایەن ئەو کەسانەی لەم بوارەدا شارەزان ئاسایە هاتاوەکو شەرع حەرامی نەکردەوە و ڕێگەی پێداوە. وەهەروەها ئەگەر ئەم بەرهەمانە بەکار بهێنرێت بەبڕوای تەواوە وەکو شیفاو چارەسەر کەبریتین لەو بەرهەمە سروشتیانەی کە لە قورئان و سونەتدا باسکراون وەکو دەوایەکی سود بەخش وەکو ئاوی زەمزەم وهەنگوین و ڕەشکەو وەهەروەهاڕونی زەیتون یەکیکە لەچارەسەرە باشەکانی بۆ خۆپیچەورکردن و خواردن لیٚ ی (العلاج بالرقـى من الكتاب والسنه-ص ٨٨-١٠١).

ئەم چارەسەرانە بکاردێت بۆ تووش بوون بە سیحر (الـمسحور)، هەروەها بۆ تووش بوون بە چاوی پیس (العين)، هەروەها بۆ کەسێکیش کەوا جنۆکە چووبێتە ناو لاشەیەوە(المس) هەروەها بۆ هەموو نەخۆشیەك.

وآخر دعوانا الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام علي نبينا محمد وعلي آله وصحبه أجمعين.

# سەرچاوەکان

## یەکەم/ سەرچاوە عەرەبییەکان:


١/ قورئانی پیرۆز

٢/ «الجامع المسند الصحيح المختصر من أُمور رسول الله صلى الله عليه وسلّم(ﷺ) وسننه وأيامه» ناسراو بە( صەحیحی بوخاری) نوسینی أبو عبد الله محمد بن إسماعيل بن إبراهيم بن المغيرة بن بَرْدِزبَ الجعفي البخاري). ناسراو به (ئیمام بوخاری)ساڵی وەفات ٢٥٦ هیجری

٣/ المسند الصحيح المختصر من السنن بنقل العدل عن العدل إلى رسول الله (ﷺ)ناسراو به (صحيح مسلم)نوسینی أبو الحسين مسلم بن الحجاج بن مسلم بن ورد بن كوشاذ القشيري النيسابوري ناسراو به (ئیمام موسلم)ساڵی وەفات ٢٦١ هیجری

٤/ ( نظم الدرر في تناسب الآيات والسور) نوسینی (إبراهيم بن عمر بن حسن الرباط بن علي بن أبي بكر البقاعي ناسراوبە( البقاعي) ساڵی وەفات ٨٨٥هیجری

٥/ (الجامع لأحكام القرآن (تفسير القرطبي)) نوسینی (محمد بن أحمد الأنصاري القرطبي أبو عبد الله) تەحقیق کردنی (عبد الله بن عبد المحسن التركي) ساڵی دەرچوون ١٤٢٧ هیجری

٦/ ( تفسير القرآن العظيم (تفسير ابن كثير) نوسینی (إسماعيل بن عمر بن كثير القرشي الدمشقي أبو الفداء عماد الدين) تەحقیق کردنی (سامي بن محمد السلامة) ساڵی دەرچوون ١٤٢٠ هیجری

٧/ (تفسير الخازن لباب التأويل في معاني التنزيل ) نوسینی (علاء الدين علي بن محمد بن إبراهيم بن عمر الشيحي أبو الحسن ) ناسراوبە( بالخازن ) ساڵی وەفات ٧٤١ هیجری

٨/ النكت والعيون (تفسير الماوردى ) نوسيني (أبو الحسن الماوردي) تەحقیق کردنی ( السيد بن عبد المقصود بن عبد الرحيم) ساڵی وەفات ٤٥٠هیجری

٩/ (تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان) ناسراو بە( تفسير السعدي) نوسینی (عبد الرحمن بن ناصر السعدي) تەحقیق کردنی (عبد الرحمن بن معلا اللويحق) ساڵی بڵاوکردنەوە ١٤٢٢هیجری

١٠/ جامع البيان عن تأويل آي القرآن (تفسير الطبري ) نوسيني (محمد بن جرير بن يزيد بن كثير بن

غالب الآملي، أبو جعفر الطبري) تەحقیق كردنی (الدكتور عبد الله بن عبد المحسن التركي بالتعاون مع مركز البحوث والدراسات الإسلامية بدار هجر الدكتور عبد السند حسن يمامة). ساڵی وەفات ٣١٠هیجری

١١/ المحرر الوجيز في تفسير الكتاب العزيز (تفسير ابن عطية) دانانی(عبد الحق بن غالب بن عطية الأندلسي أبو محمد) تەحقیق كردن (عبد السلام عبد الشافي محمد)ساڵی وەفات( ٥٤١ هیجر)

١٢/ /(فتح البيان في مقاصد القرآن) دانانی(صديق حسن خان القنوجي) تەحقیق كردنی (عبد الله بن إبراهيم الأنصاري) ساڵی وەفات (١٣٠٧ هیجری)

١٣/(تفسير الدر المنثور في التفسير بالمأثور) دانانی (عبد الرحمن بن كمال الدين أبي بكر بن محمد سابق الدين خضر الخضيري الأسيوطي ( جلال الدين السيوطي، ) تەحقیق كردنی (عبد الله بن عبد المحسن التركي) ساڵی وەفات ( ٩١١هیجری)

١٤ / ( تفسير القرآن الكريم (تفسير العثيمين) نوسینی(محمد بن صالح العثيمين)

١٥/ (مجموع الفتاوى) نوسینی( تقي الدين أبو العباس أحمد بن عبد الحليم بن تيمية الحراني ) ساڵی وەفات ٧٢٨ هیجری

١٦/(مسند الإمام أحمد بن حنبل) دانانی (أحمد بن حنبل) تەحقیق كردنی (شعيب الأرناؤوط وآخرون) ساڵی وەفات (٢٤١ هجری)

١٧//( صحيح الجامع الصغير وزيادته) نوسینی(محمد ناصر الدين الألباني) ساڵی دەرچوون (١٤٠٨هیجری)

١٨/(صحيح سنن أبي داود - ضعيف سنن أبي داود (الكتاب الأم)) دانانی (أبو داود؛ سليمان بن الأشعث بن إسحاق بن بشير الأزدي السجستاني، أبو داود - محمد ناصر الدين الألباني) تەحقیق كردنی ساڵی بڵاوبونەوە (١٤٢٣هیجری)

١٩/( عون المعبود على شرح سنن أبي داود (ط. دار ابن حزم)) دانانی (شرف الحق العظيم آبادي أبو عبد الرحمن) تەحقیق كردنی (أبو عبد الله النعماني الأثري ساڵی بڵاوبونەوە (١٤٢٦)

٢٠/( تفسير القرآن (تفسير السمعاني)) دانانی (منصور بن محمد بن عبد الجبار التميمي المروزي

الشافعي السلفي أبو المظفر السمعاني) تەحقیق کردنی (ياسر بن إبراهيم أبو تميم - غنيم بن عباس أبو بلال) ساڵی بڵاوبونەوە (١٤١٨هیجری)

٢١/(البحر المحيط في التفسير) دانانی (أثير الدين أبو حيان محمد بن يوسف بن علي بن يوسف الأندلسي) تەحقیق کردنی (صدقي محمد جميل) ساڵی بڵاوبونەوە (١٤٣١هیجری)

٢٢/( موسوعة العلامة الإمام مجدد العصر محمد ناصر الدين الألباني «موسوعة تحتوي على أكثر من (٥٠) عملا ودراسة حول العلامة الألباني وتراثه الخالد») دانانی (أبو عبد الرحمن محمد ناصر الدين، بن الحاج نوح بن نجاتي بن آدم، الأشقودري الألباني) تەحقیق کردنی (شادي بن محمد بن سالم آل نعمان الناشر :مركز النعمان للبحوث والدراسات الإسلامية وتحقيق التراث والترجمة، صنعاء - اليمن)ساڵی وەفات (١٤٢٠هیجری)

٢٣/(التسهيل لعلوم التنزيل) دانانی ( محمد بن أحمد بن جزي الكلبي أبو القاسم) تەحقیق کردنی (محمد سالم هاشم)ساڵی وەفات (٧٥٨هیجری)

٢٣/( سلسلة الأحاديث الصحيحة وشيء من فقهها وفوائدها (السلسلة الصحيحة)) دانانی (الألباني، أبو عبد الرحمن محمد ناصر الدين) ساڵی بڵاوبونەوە (١٤١٥ هیجری)

٢٤/( الفتاوى الحديثية لابن حجر الهيتمي) دانانی (أحمد بن محمد بن علي بن حجر الهيتمي السعدي الأنصاري، شهاب الدين شيخ الإسلام، أبو العباسساڵی وەفات (٩٧٤هیجری)

٢٥/( الردود البازية في بعض المسائل العقدية) دانانی (عبد العزيز بن عبد الله بن باز) تەحقیق کردنی (أحمد محمد العمران)ساڵی وەفات (١٤١٩هیجری)

٢٦/( فتح الباري شرح صحيح البخاري) دانانی (ابن حجر العسقلاني؛ أحمد بن علي بن محمد الكناني العسقلاني، أبو الفضل، شهاب الدين، ابن حجر) تەحقیق کردنی (عبد العزيز بن عبد الله بن باز - محمد فؤاد عبد الباقي - محب الدين الخطيب) ساڵی وەفات (٨٥٢ هیجری)

٢٧( شرح بلوغ المرام المؤلف) دانانی (عطية بن محمد سالم) تەحقیق کردنی (مصدر الكتاب : دروس صوتية قام بتفريغها موقع الشبكة الإسلامية الكتاب مرقم آليا، ورقم الجزء هو رقم الدرس - ٢٣١ درسا) ساڵی وەفات (١٤٢٠هیجری)

٢٨/(مختصر زوائد مسند البزار) دانانی (ابن حجر العسقلاني) تەحقیق كردنی ( صبري عبد الخالق أبو ذر) ساڵی وەفات (٨٥٢)

٢٩/ (منهج الشرع في علاج المس والصرع) دانانی (أسامة بن ياسين المعاني) ساڵی دەرچوون (١٤٢٩ هیجری)

٣٠/( كتاب الفتاوى الشرعيه في المسائل العصريه من فتاوى علماء البلد الحرام) دانانی (مجموعة من العلماء) تەحقیق كردنی (خالد بن عبد الرحمن الجريسي) ساڵی دەرچون (١٤٢٩ هیجری)

٣١/(شرح رياض الصالحين من كلام سيد المرسلين (صلى الله عليه وسلم) دانانی(محمد بن صالح العثيمين)

٣٢/ (لسان العرب) دانانی (المؤلف: ابن منظور؛ محمد بن مكرم بن علي، أبو الفضل، جمال الدين ابن منظور الأنصاري الرويفعي الإفريقي، صاحب (لسان العرب))

عالم الجن والشياطين ) نوسینی (عمر سليمان الأشقر) ساڵی دەرچوون (١٤٠٤(٣٣/

٣٤/ البداية والنهاية (ط. المعارف)) نوسینی (ابن كثير؛ إسماعيل بن عمر بن كثير بن ضو بن درع القرشي البصروي ثم الدمشقي، أبو الفداء، عماد الدين) ساڵی وەفات (٧٧٤هیجری)

)فتاوى نور على الدرب) نوسینی (محمد بن صالح العثيمين(٣٥/

العقيدة الإسلامية وأسسها) نوسینی (عبد الرحمن حسن حبنكة الميداني(٣٦/

٣٧/ الصحيح المسندمن أسباب النزول)نوسینی(مقبل بن هادي الوادعي أبوعبد الرحمن)ساڵی دەرچوون(١٤٢٥ هیجری(

) ٣٨/ شرح السنة (ت: الأرناؤوط)) نوسینی (الحسين بن مسعود بن محمد بن الفراء البغوي أبو محمد) ساڵی دەرچوون (١٤٠٣ هیجری(

٣٩/المغني شرح مختصر الخرقي) نوسینی (ابن قدامة؛ عبد الله بن محمد بن قدامة الجماعيلي المقدسي ثم الدمشقي الحنبلي) ساڵی وەفات(٦٢٠ هیجری)

شرح كتاب التوحيد) نوسینی (عبد العزيز بن عبد الله بن باز) ساڵی وەفات( ١٤٢٩هیجری(٤٠)

٤١)مدارك التنزيل وحقائق التأويل (تفسير النسفي) (ط. الكلم الطيب)) نوسینی (عبد الله بن أحمد

بن محمود النسفي أبو البركات ) ساڵی وەفات( ٧١٠هیجر)

٤٢)أعلام الحديث في شرح صحيح البخاري) نوسینی (حمد بن محمد الخطابي أبو سليمان) ساڵی وەفات( ٣١٨هیجری (٤٣)شرح اعتقاد أهل السنة) نوسینی (الشيخ عبد الله بن عبدالرحمن الجبرين رحمه الله) ساڵی وەفات( ١٤٣٠هیجری(

٤٤)تفسير القرآن الحكيم (تفسير المنار) نوسینی (محمد رشيد بن علي رضا بن محمد شمس الدين بن محمد بهاء الدين بن منلا علي خليفة القلموني الحسيني (المتوفى: ١٣٥٤هـ) ) ساڵی وەفات( ١٣٥٤هیجری

(٤٥) تحصين الإنسان من السحر والجن والشيطان بالأذكار والأوراد والقرآن) نوسینی (محمد أمين الضناوي (.

(٤٦) أربعون درسا لمن أدرك رمضان- ٩٨)) نوسینی ( عبدالملك القاسم

(٤٧)الصارم البتار في التصدي للسحرة الأشرار) نوسینی (وحيد بن عبد السلام بالي

٤٨ شرح مشكل الآثار (ت: الأرناؤوط)) نوسینی (أبو جعفر الطحاوي ) ساڵی وەفات( ٣٢١هیجری

٤٩)(هداية الرواة إلى تخريج أحاديث المصابيح والمشكاة) نوسینی (ابن حجر العسقلاني؛ أحمد بن علي بن محمد الكناني العسقلاني، أبو الفضل، شهاب الدين، ابن حجر - محمد ناصر الدين الألباني (

٥٠)المنهاج في شرح صحيح مسلم بن الحجاج (صحيح مسلم بشرح النووي) (ط قرطبة)) نوسینی (يحيى بن شرف النووي محي الدين أبو زكريا ) ساڵی وەفات( ٦٧٦هیجری(

٥١العلاج بالرقى من الكتاب والسنة) نوسینی (سعيد بن على بن وهف القحطاني

## دووەم / سەرچاوەکوردیەکان:

*************

١/ (تفسيرى رِێبەر ) نوسينى (م. صلاحدين عبدالكريم ) ساڵى دەرچون ١٤٤٠ هيجرى

٢/ (تفسيرى ڕامان) نوسينى ( مەلا ئەحمەد کاکە مەحموود) ساڵى دەرچون ١٤٢٦ هيجرى

٣/ (تەفسيرى ئاسان بۆ تێگەيشتنى قورئان) نوسينى ( برهان محمدأمين)

٤/ (پوختەى تەفسيرى قورئان ) نوسينى (محمد مەلا صالح)

٥/ (تەفسيرى گوڵشەن) نوسينى ( نظام الدين عبد الحميد،)چاپى يەکەم ١٤٢٤هـ

٦/ (پوختەى صحيح موسلم ) نوسينى(كي الدين ، عبد العظيم بن عبد القوي ، المنذري ، المتوفي سنة ٩٥٩ هـ) وەرگێڕانى بۆ کوردى (ليژنەيەك) ساڵى بڵاوبونەوە (١٤٢٦ هيجرى)

٧/ (مختصر صحيح البخاري المسمى بالتجريد الصريح) نوسيني( ابي العباس زين الدين الزبيدي). ومرگيرانى (نورى فارس حە مە خان) ساڵى دەرچون (١٤٣١هيجر)